# ناسنامەی کتێب


❖ ناوی کتێب: بزانە دەربارەی قورئان

❖ ئامادەکردنی: محەمەد پشتیوان

❖ بابەت: زانیاریی ئایینی

❖ دیزاین: هونەر عوسمان

❖ قەبارە: ١٤* ٢١ سم

❖ ژمارەی لاپەرە:١٧٤ لاپەڕە

❖ نۆبەتی چاپ: یەکەم

❖ ساڵی چاپ: ٢٠٢١

❖ چاپخانە: چاپەمەنیی ناوەندی سارا

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردن (١٦٣٣)ی ساڵی ٢٠٢١ی پێدراوە

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا ۜ﴾ الكهف: ١

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم كتێبە كە قورئانە بۆ سەر بەندەی خۆی (محمد ﷺ) دابەزاندووە، هیچ كەم و كووڕی و ناتەواویەكیشی بۆ ڕەوا نەداوە .

## سوپاس و پیزانین

سوپاس و پێزانینی تایبەتم هەیە بۆ مامۆستای زۆر بەڕێز و خۆشەویست و لەدڵا شیرینی من مامۆستا (ڕێبەر محمد صاڵح) کە ئەرکی پێداچوونەوە و هەڵەچنی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆ، وە سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی هاوکاری و پشگیریان کردووم لە ئامادەکردنی ئەم کتێبە ئەگەر بەوشەیەکیش بوو بێت، داواکارم لە خودای گەورە بیکاتە مایەی خێر بۆ هەموو لایەک.

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

وەک لە نـاوی کتێـبەکەدا دیـارە ئەم کتێـبە زیـادکردنی زانیاریەکـانە سەبارەت بە قورئان یان ئەوانەی قورئان باسی کردوون، وەلایەنی زاڵـی ئەم کتێبە ژمارەکانن هەر ئەمەش بۆتە هۆی هەڵبژاردنی ئەم شێوازەی ئێستای، بێگومان ئەم کتێبە لە هەڵە و کەموکوڕی بەدەر نیە وەک هەر کتێبێکـی تـر، ئەو کتێـبەی خـاڵیە لە هەڵە تەنهـا کتێـبە پیـرۆزەکەی خودایە،گەرچی ئەمە یەکەم ئەزمونی نوسینمە بەڵام هەوڵی تەواوم داوە شـتێکی بـێ هەڵە و ئـاڵۆزی بێـت و ئەوەنەی توانیـومە لە ڕاسـتی و دروستی سەرچاوەکان و دەقەکان خۆم دڵنیاکردۆتەوە،لە کۆتایدا ئامانج لە نوسـینی ئەم کتێـبە زیـادکردنی زانیاریەکـانی تـاکە سـەبارەت بە قورئانی پیرۆز و تێڕامان لەو هەموو ئیعجاز و دەقە ناوازانەی قورئان.

داواکارم لە خودای گەورە بیکاتە مایەی خێر بۆ هەموو ئەوانەی بەدوای چاکەدا وێڵن و تۆوی چاکە بـڵاو دەکەنەوە،بـزانن پێغەمـبەری خـودا ﷺ دەفەرموێـت: ئەوەی چـاکەیەک فێـری کەسـێک بکـات خێـرەکەی وەک ئەوەیە کردبێتی، بۆیە ئەم کتێبە یان زانیاریەکانی ناوی بڵاو بکەنەوە و بەشداربن لەم خێرەدا.

**چەند تێبینیەک....**

١ – لە کۆتای هەموو ئایەتەکان ئەوەی پێویستی کردبێت بە فۆنتێکی بچوک ناوی سورەت یان ژمارەی ئایەتەکەم نووسیوە بۆ ئەو کەسانە ئارەزوو بکەن لە قورئاندا سەیری بکەنەوە یاخود تەفسیرە کوردیەکەی بخوێنەوە.

٢ – هەر نووسینێک ناوی نووسەر یان وەرگێڕی ئەگەر هەبووبێت ئاماژەم پێکردوە لە پەراوێزی لاپەڕەکاندا.

٣ – ئەو وشانەی بەگرنگم زانیبێت یان ویستبێتم سەرنجی خوێنەری بۆ ڕابکێشم کردومەتە نێوان جووت کەوانە () یان ڕەنگێکی سورم پێداوە.

٤ – بەشی یەکەمی کتێبەکە بە زانیاری سادە و گشتی و هەمەجۆر دەسپێدەکات پاشان وردە وردە لەو بارودۆخە دەردەچێت و لە بەشەکانی تردا زیاتر سەرنج ڕاکێش دەبێت.

٥ – لە هەر ئایەتێکدا ئەم سێ خاڵەم (...) دانابوو واتا تەواوی ئایەتەکەم نەهێناوە ئایەتەکە زیاترە لەوەی کەمن دامناوە، ئەگەر لە سەرەتای ئایەتەکەدا ئەم سێ خاڵەم دانابوو واتا سەرەتای ئایەتەکەم نەهێناوە (... ئایەت)، بەلام ئەگەر لە کۆتایی ئایەتەکەدا دامنابوو واتا کۆتای ئایەتەکەم نەهێناوە (ئایەت...)، خۆ ئەگەر لە سەرەتا و کۆتای دام نابوو واتە تەنها ناوەراستی ئایەتەکەم هێناوە (... ئایەت...).

٦ – لە کاتی بوونی هەر ڕەخنە و تێبینی و هەڵە و زیادکرنێک یان بەکارهێنانی ئەم کتێبە بۆ هەر مەبەستێکی تر پەیوەندی بەخۆمەوە بکەن. https://www.facebook.com/Mhamad.pshtiwan.ahmad

# (سورەت و ئایەت)

بزانە...

قورئانی پیرۆز (١١٤) سورەتە[*].

بزانە...

قورئانی پیرۆز (٣٠) جوزئە.

بزانە...

قورئانی پیرۆز (٦٠) حیزبە.

بزانە...

قورئانی پیرۆز (٢٤٠) چارەکە.

---

[*] وشەی (سورەت و ئایەت) لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون بۆ نمونە:

﴿ سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾. النور ١

واتا: (ئەمە سورەتێکە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە و فەرزمان کردووە (گوێڕایەڵی بڕیارەکانی) وە لەو (سورەتە) دا هێناومانەتە خوارەوە ئایەتە ڕوونەکان بۆ ئەوەی ئێوە بیر بکەنەوە). وشەی (السورة) بەواتای پایەی بەرز دێت و بە واتای شورەی شاریش دێت، ڕونیشە ئەو کۆمەڵە ئایەتەی پێکەوە ناویان نراوە سورەت هەم پایەی بەرزیان هەیە و هەم هەر سورەتێکیش وەک شورە دەوری کۆمەڵێک ئایەتی داوە. وە وشەی (اية) بەواتای نیشانە (علامة) دێت.

بزانە ...

قورئانی پیرۆز (٦٢٣٦) ئایەتە.

بزانە ...

قورئانی پیرۆز (٨٦٩٦٧) وشەیە.

بزانە ...

قورئانی پیرۆز (٣٢٢٥٦٧) پیتە.

بزانە ...

قورئانی پیرۆز (١٠١٥٠٣٠) خاڵی هەیە.

بزانە ...

ژمارەی (وەحی – سروشەکان)ی قورئانی پیرۆز (٢٤٠٠) جارە.

بزانە ...

لە ماوەی (٢٣) ساڵدا هەموو قورئانی پیرۆز دابەزی.

بزانە ...

ئەو سورەتەی ئەکەوێتە ناوەڕاستی قورئان: سورەتی (کهفە).

بزانە ...

درێژترین سورەتی قورئانی پیرۆز (بەقەرەیە) و ژمارەی ئایەتەکانی (٢٨٦) ئایەتە.

بزانە ...

کورتترین سورەتی قورئانی پیرۆز (کەوسەرە) و ژمارەی ئایەتەکانی (٣) ئایەتە.

بزانە ...

سورەتەکانی قورئانی پیرۆز (٢٨) سورەتیان (مەدینەییە).

بزانە ...

سورەتەکانی قورئانی پیرۆز (٨٦) سورەتیان (مەکەییە).

بزانە ...

ئەو وشەیەی ئەکەوێتە ناوەڕاستی قورئانی پیرۆز لە سورەتی (کەهفدا) بریتیە لە وشەی (ولیتلطف).

بزانە ...

پیتی (ت) ئەکەوێتە ناوەراستی قورئانی پیرۆز لە وشەی (ولیتلطف) لە سورەتی (کەهفدا).

بزانە ...

هیچ جارێک ناوی حەوا لە قورئاندا نەهاتوە.

بزانە ...

بۆ یەکەم جار قورئانی پیرۆز لە ئەشکەوتی (حراء) دابەزی لە مانگی ڕەمەزاندا.

بزانە ...

خێری خوێندنی یەک پیت لە قورئان (١٠) چاکەیە.*

بزانە ...

هەمــوو ســورەتەکانی قورئــان بە (بســم‌الله) دەس پــێ ئەکەن جـگە لە (سورەتی التوبە).

بزانە ...

کورترین (ئایەتە پیت) لە قورئانی پیرۆز بریتیە لە (سێ) ئایەت ئەوانیش: ئایەتی (یس) و (حم) و (طه).

بزانە ...

یەکەم کڕنوش لە کورنوشەکانی قورئانی پیرۆز بەپێی موصحەف لە سورەتی الاعرافدایە.

﴿... لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ۩﴾. ٢٠٦

بزانە ...

تا ئێستا درێژترین کۆپی قورئانی پیرۆز دروستکرابێت لەلایەن پیاوێکی میصری دانیشتوی قاهیرە بووە بەناوی (سعد محمد) کە بەماوەی (٣) ساڵ توانی قورئانێک بەدرێژی (٧٠٠) مەتر بنەخشێنێت لەسەر کاغەزی زەغرەفەدار.

* واتا کە ئەڵێی (الم) ئەوا (٣٠) چاکەت بۆ ئەنووسرێت.

بزانه ...

سوڕەتی (نمل) دوو (بسم‌الله) تێدایه.

بزانه ...

له قورئاندا دوو ئایەت هەیه هەموو پیتەکانی زمانی عەرەبی تێدایه ئەوانیش بریتین له: ئایەتی (١٥٤: آل عمران) وه ئایەتی (٢٩: الفتح).

بزانه ...

دوو سـوڕەت هەن له قورئـانی پیـرۆزدا یەکەمیـان به وشـەیەک دەسپێدەکات و سـوڕەتی دووەم بەهەمان وشه کۆتـای دێت بریتین لـه: سـوڕەتی (فەجـر) له قورئانـدا به وشـەی (الفجـر) دەسـپێدەکات و سوڕەتی (قەدر) به وشەی (الفجر) کۆتای دێت.

بزانه ...

ئەو سوڕەتەی ئایەتەل کورسی تێدایه سوڕەتی (بەقەڕەیه).

بزانه ...

سوڕەتی (التوبه) دوو ناوی تری هەیه بریتین له:

سوڕەتی ( براءة ) وه ( الفاضحة ).

بزانه ...

ئەو دوو سوڕەتـەی پێشتر بەدوو هاوسەرەکه ناو دەبران سوڕەتەکانی ( ئەنفال و التوبه)یه.

**بزانە ...**

یەکەم ئافرەت لە قورئاندا ناوی هات ( مەریەمی کچی عمران) بوو.

**بزانە ...**

ماوەی دابەزاندنی قورئانی کەریم لە (مەکە)ی پیرۆز بریتیبوو لە:
( ١٢ساڵ و ٥ مانگ و ١٣ڕۆژ).

**بزانە ...**

سورەتی (حەج) لە قورئانی پیرۆز (دوو سوجدەی) تێدایە.

﴿... وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ۩﴾. ١٨

﴿... وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩﴾ ٧٧

**بزانە ...**

ماوەی دابەزینی قورئانی کەریم لە (مەدینە)ی پیرۆز بریتیبوو لە:
(٩ساڵ و ٩ مانگ و ٩ ڕۆژ).

**بزانە ...**

ئەو پیاوە ئیماندارە و هاوسەرە کافرەی لە قورئاندا باسکراوە:
(پێغەمبەر لوط و خێزانەکەین).

﴿... إِلَّا امْرَأَتَكَ إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ ... ﴾. هود ٨١

**بزانە ...**

سورەتی (الفاتحة) لە مەکە دابەزیوە.

بزانه ...

تاكه ئافرەت سورەتێكی قورئان بەناویەوە كرابێت خاتوو (مەریەمـ)ـه.

بزانه ...

(٢٩) سورەتی قورئان به پیته پچڕ پچڕەكان دەستیان پێكردوە.*

بزانه ...

له سورەتێكی قورئانی پیرۆزدا وشەی (لبن-شیر) هاتوه ئەویش سورەتی (محمد)ه: ﴿... وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ...﴾. محمد ١٥

بزانه ...

یەكەم سورەت دوای (كۆچكردن) له مەدینه هاته خوارەوە سورەتی (بەقەرە)بوو.

بزانه ...

یەكەم كەس كه قورئانی باسكرد (عبد الله بن مسعود)بوو.

بزانه ...

یەكەم دروستكراو كه له قورئاندا باسكراوه سەرپێچی فەرمانی خودای گەورەی كرد و لەخودا یاخی بوو: (شەیتان) بوو.

* بریتین له (البقرة، ال عمران، الاعراف، یونس، هود، یوسف، الرعد، ابراهیم، الحجر، مریم، طه، الشعراء، النمل، القصص، العنكبوت، الروم، لقمان، السجدة، یس، ص، غافر، فصلت، الشورى، الزخرف، الدخان، الجاثیة، الاحقاف، ق، القلم).

بزانه ...

یەکەم سورەتی قورئانی پیرۆز کە (بەتەواوی- کاملی) هاتە خوارەوە سورەتی (المدثر)بوو.

بزانه ...

ئەو چیرۆکانەی لە سورەتی (آل عمران) هاتوون چیرۆکی: (مریم) و(یحیا ) و(عیسا)یە.

بزانه ...

سورەتی نوور باسی ڕوداوی جیابوونەوەی کرد.

بزانه ...

یەکێک لە سورەتەکانی قورئان بەناوی ئەستێرەیەکەوە ناو نراوە ئەویش سورەتی : (الشمس).

بزانه ...

سورەتی (الاخلاص) تاکە سورەتە کە (یەک کەسرەی) تێدایە، بێ لە کەسرەی (بِسمِ‌الله).

بزانه ...

لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە لە ڕۆژی قیامەتدا (هەشت) فریشتە عەرشی خودا هەڵدەگرن.

﴿وَالْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴾ الحاقه١٧

بزانە ...

سورەتێک هەیە لە قورئاندا پێی دەوترێت سورەتی (النسائی بچووک) ئەویش: (سورەتی طەلاقە).

بزانە ...

سورەتی (الاخلاص) کۆتای هەموو ئایەتەکانی بەپیتی (د) کۆتای دێت.

بزانە ...

هەموو قورئانی پیرۆز کۆ کرایەوە لە ساڵی (٢٥ی کۆچی) بەدەستی (عثمان بن عفان).

بزانە ...

هەموو سورەتەکانی قورئان ناوێکی تایبەتیان هەیە،بەڵام هەندێک سورەت زیاتر لە ناوێکیان هەیە بۆ نمونە سورەتی (الفاتحە) زیاتر لە (٢٠) ناوی هەیە لەوانە: الحمد- ام الكتاب- السبع المثاني – الكنز – الوافية – الكافية- الشافية وە هتد...

بزانە ...

لە قورئاندا (١٠) سورەتی مەدینەی بەدوای یەکدا هاتوون بەشێوەی تەسەسول کە بریتین لە: (سورەتی الحدید، سورەتی المجادلة، سورەتی الحشر، سورەتی الممتحنة، سورەتی الصف، سورەتی الجمعة، سورەتی المنافقون، سورەتی التغابن، سورەتی الطلاق، سورەتی التحریم).

بزانە ...

لە موصحەفدا یەکەم سورەت فاتیحایە و کۆتا سورەت الناسە.

بزانە ...

خوێندنی (١٠) ئایەتی سەرەتای سورەتی (کهف) ئەتپارێزێت لە (مەسیحی دجال).

بزانە ...

ئادەمیزاد سەبارەت بە قورئان سێ دەستە و تاقمن (بەقەرە -٢٢،٢١):

١-پارێزکاران و شوێن کەوتووی حەق.

٢- کەلە ڕەق و حاشاکەر لەحەق و ڕاستی.

٣- دوودڵ و بەگومان و بێ بار.

بزانە ...

هەرماڵێک سورەتی (بەقەرەی) تێدا بخوێنرێت ئەوا شەیتان لەو ماڵ و جێگایەدا هەڵدێت و ڕادەکات بۆیە ماڵەکانتان مەکەن بە (گۆڕستان).

بزانە ...

ئەو سورەتەی نیوەی قورئانە بریتیە لە: (سورەتی الزلزلة).

بزانە ...

یەکەم ئایەتی قورئان لە ئەشکەوتی حراء لە (٢٧ی مانگی ڕەمەزان) دابەزیوە لە مەکەی پیرۆز.

بزانە ...

جەلالەدینی بولقینی لە کتێبی (مواقع العلوم فی مواقع النجوم)دا دەڵێ: پتر لە (٥٠) زانستی جۆراو جۆر لەمەڕ قورئانەوە تۆمارکراون.

بزانە ...

ئەو سورەتەی قورئانی پیرۆز کە هیچ پیتێکی (م) تێدا نیە بریتیە لە: (سورەتی کەوسەر).

بزانە ...

ئەو سورەتەی قورئانی پیرۆز کە هیچ پیتێکی (ک) تێدا نیە بریتیە لە: (قریش و الفلق و العصر).

بزانە ...

ئەو سورەتەی ناسناوی ( بالکافیة) لێ نراوە سورتی: (فاتیحا)یە.

بزانە ...

سورەتی (النعم-بەڵێ) سورەتی (النحل)ـە.

بزانە ...

سورەتی (نوح) کەبەناوی پێغەمبەر نوحەوەیە پێک هاتوە لە (٩٥٠) وشە، لە هەمان کاتدا پێغەمبەر نوحیش (علیە سلام) (٩٥٠) ساڵ پێغەمبەرایەتی کردووە.

بزانه ...

سورەتی (الملائكة - فریشتە) سورەتی (فاطر)ە.

بزانه ...

(شەش) سورەتی قورئانی پیرۆز بە ناوی پێغەمبەرانەوەیە، ئەوانیش بریتین لە: (یونس — هود — یوسف — ابراهیم — محمد — نوح).

بزانه ...

سورەتی ئابڕوو بەران و ئاشکرابوونیان سورەتی (التوبة)یە.

بزانه ...

سورەتی (المؤمن-باوەڕدار) سورەتی (غافر)ە.

بزانه ...

سورەتی (القتال-شەڕ) سورەتی (محمد)ە.

بزانه ...

چیرۆکی دایکی موسا لە دوو سورەتی قورئانی پیرۆزدا هاتوە کە بریتین لە: سورەتی (طه و القصص).

بزانه ...

ئەم سورەتانە بەناوی ڕۆژی قیامەت و ترسەکانی ناونراون:

(الدخان، الواقعه، الحشر، التغابن، الحاقه، القیامه، النبا، التكوير، الانفطار، الانشقاق، الغاشیه، الزلزله، القارعه).

بزانە ...

سورەتی (بني اسرائيل ) سورەتی (الإسراء).

بزانە ...

سورەتی (الدهر- ڕۆژگار) سورەتی (الإنسان)ە.

بزانە ...

ئەو سورەتەی باسی چیرۆکی بەنی ئیسڕائیلی تێدا هاتووە سورەتی (المائدة).

بزانە ...

ئەم سورەتانەی ناو نراوە بەناوی سیفەتی فریشتەکانەوە:
(الصافات – المعارج – النازعات).

بزانە ...

ئەم سورەتانە بەناوی سیفاتی قورئانی پیرۆزەوە ناو نراون:
(الفرقان – فصلت).

بزانە ...

ئەم سورەتانە بەناوی شتەکانەوە ناونراون:
(المائده، الحديد، القلم، الماعون، المسد).

بزانە ...

سورەتی (الإخلاص) یەک لەسەر سێی قورئانە.

بزانە ...

سورەتی (الكافرون) یەک لەسەر چواری قورئانە.

بزانە ...

دووەم درێژترین سورەتی قورئان لە دوای سورەتی بەقەرە بریتیە لە سورەتی (الشعراء) کەژمارەی ئایەتەکانی (٢٧٧) ئایەتە.

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز بەناوی (کات)ـەکانەوە ناونراون:

(القدر، الحج، الفجر، الجمعه، الضحى، الليل، الفلق، العصر).*

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز دەسپێدەکەن بە (الم):

(البقره، ال عمران، العنكبوت، الروم، القمان، السجده).

بزانە ...

سوجدەکانی قورئانی پیرۆز کە ژمارەیان (١٥) سوجدەیە لە (١٤) سورەتدا هاتوون.

بزانە ...

سورەتی (ص) پێی دەوترێ سورەتی (داود).

---

* واتاکانیان بە کوردی (شەوی قەدر، کاتی حەج، بەرەبەیان، هەینی، چێشتەنگاو، شەو، بەرەبەیان، زەمانە).

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز دەسپێدەکەن بە (الر):

(یونس، هود، یوسف، ابراهیم، الحجر).

بزانە ...

ئەم سورەتەی قورئانی پیرۆز دابەزی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ کاتێک لە حودیبیە دەگەڕایەوە و ڕێگای مەدینەی پیرۆزی گرتەبەر لەو کاتەدا دابەزی ئەم سورەتەش سورەتی (مائیدەیە).[1]

بزانە ...

لە قورئاندا باسی غەزای (الخندق) لە سورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٢٧،٩)دا هاتووە.

بزانە ...

قورئانی پیرۆز ئامۆژگاریە: ﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾. القلم ٥٢

بزانە ...

لە قورئاندا باسی غەزای (تبوک) لە سورەتی (التوبة) ئایەتی (١٢٩،٣٨)دا هاتووە.

---

[1] روى الإمام ا احمد: عن عبدالله بن عمرو بن العاص – رضي الله عنه – قال: انزلت على رسول الله: سورة المائدة وهو راكب على راحلته ، فلم تستطع ان تحمله فنزل عنها.

بزانە ...

لە قورئانـدا باسـی غەزای (حمـراء الأسـد ) لە سـورەتی (آل عمـران) ئایەتی (١٧٢،١٧٤)دا هاتووە.

بزانە ...

ئەم سـورەتەی قورئـانی پیـرۆز (١٨) ئەرکـی تێـدایە ئەویـش سـورەتی (مائیدەیە).

بزانە ...

هەر کەسێک شەوانە سورەتی (الدخان ) بخوێنێـت ئەوا (٧٠٠٠) فریشـتە تا ڕۆژەبێتەوە داوای لێخۆشبوونی بۆدەکەن لە خودا.

بزانە ...

ئەگەر دوای هەموو نوێژێک ئایەتەل کورسی بخوێنیت ئەوا لە نێـوان تـۆ و بەهەشتدا تەنها مردن هەیە.

بزانە ...

لە قورئـانی پیـرۆزدا باسـی شـاری پێغەمـبەر ﷺ کـراوە بە دوو نـاوی جیاواز ئەوانیش: (یثرب) و (المدینة).

بزانە ...

هەر کەسـێک (١٠) جـار سـورەتی (الاخـلاص) بخوێنێـت ئەوا خـودای گەورە کۆشکێکی لەبەهەشت بۆ دروستەکات.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الفاتحة) دەتپارێزێت لە تورەی خودا.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الدخان) ئەتپارێزێت لە ناخۆشیەکانی ڕۆژی دوای.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الواقعە) دەتپارێزێت لە هەژاری.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الملک) دەتپارێزێت لە ئازاری ناو گۆڕ.

بزانە ...

سورەتی (یس) بە دڵی قورئان ناسراوە.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الکوثر) دەتپارێزێت لە دووژمنداری.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الکافیرون) دەتپارێزێت لە کفر لە کاتی مردن.

بزانە ...

لە قورئاندا غەزای (بەدر) لە ئایەتی (یەک) لە سورەتی (ئەنفالدا) هاتووە: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنفَالِ قُلِ الْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ...﴾.

بزانە ...

ناوی ئەسڵی قورئانی پیرۆز (فرقان)ـە.

بزانە ...

نازناوی قورئانی پیرۆز (مجید)ە.

بزانە ...

گەورەترین ئایەتی قورئانی پیرۆز (ئایەتەل کورسیە).

بزانە ...

ئەو سورەتەی لە قورئانی پیرۆزدا زۆرترین نیعمەتەکانی تێدا هاتووە: سورەتی (النحل)ـە.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الاخلاص) دەتپارێزێت لە دوو ڕووی.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الفلق) دەتپارێزێت لە حەسودی.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (الناس) دەتپارێزێت لە قەلەقی و دڵە ڕاوکێ.

بزانە ...

خوێندنی سورەتی (یس) دەتپارێزێت لە تونیەتی ڕۆژی قیامەت.

بزانە ...

ناوی شاری پێغەمبەر ﷺ (١٥) جار لە قورئاندا هاتوە:

(١٤) جار بە مەدینە و (١) جار بە یثریب.*

بزانە ...

سوڕەتی (بني النظير) سوڕەتی (الحشر)ە.

بزانە ...

دایکی قورئان سوڕەتی (الفاتحة)یە.

بزانە ...

ماڵی خاتوو خەدیجە یەکەم ماڵبوو بۆ یەکەم جار قورئانی تێدا خوێندرا

بزانە ...

ئەو پیتەی زۆرترین جار لە قورئانی پیرۆزدا دووبارە بۆتەوە پیتی (ئەلیف)ـە.

بزانە ...

ئەگەر کۆتا دوو ئایەتی سوڕەتی (البقره) بخوێنیت لە ناو ماڵەکەت شەیتان ناتوانێت تا (سێ) ڕۆژ نزیکی ماڵەکەت بکەوێتەوە.

---

* بە مەدینە (الاعراف:١٢٣، التوبه:١٠١:١٢٠، یوسف:٣٠، الحجر:٦٧، الکهف:١٩:٨٢، النمل:٤٨، القصص:١٥:١٨:٢٠، الاحزاب:٦٠، یس:٢٠، المنافقون:٨)، بە یثریب (الاحزاب:١٣).

بزانە ...

بوکی قورئان سوڕەتی (الرحمن)نە.

بزانە ...

ناخۆشترین و قورسترین وشەی حەڵاڵ لە قورئاندا هاتووە (تەڵاقـ)ـە.

بزانە ...

پێش کۆچکردن بۆ مەدینە پێغەمبەری خودا ﷺ دوو هاوەڵی نارد بۆ لای ئەهلی مەدینە کە فێری ئیسلام و خوێندنەوەی قورئانیان بکەن،ئەو هاوەڵانەش بریتی بوون لە: (مصعب بن عمیر، کوڕی ئوم مکتوم).

بزانە ...

صەدام حوسێن خاوەنی قورئانێک بوو بە خوێنی خۆی نوسرابویەوە و (٢٧) لیتر لە خوێنی خۆی بەکار هێنابوو تا هەموو قورئانی پیرۆزی پێ بنوسرێتەوە. ئێستاش ئەو قورئانە ماوە و لە مۆزەخانەی بەغداد پارێزراوە.

بزانە ...

ماڵەکەی پێغەمبەر (لوط) تاکە ماڵی باوەڕداربوو لە شارەکەیدا (سدوم) هەموو ماڵەکانی تر بێ باوەڕبوون، لەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزدا ئەمەمان بۆ دەرەکەوێت:

﴿ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ الْمُسْلِمِينَ﴾. الذاريات ٣٦

(لەماڵە موسوڵمانێکیش زیاترمان بەدی نەکرد).

بزانه ...

له سورەتی ڕەحماندا (٣١) جار ئەم ئایەته دوو باره بۆتەوه:

﴿ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾.

بزانه ...

(عەلی کوڕی ئەبوو طالیب) یەکەم کەس بوو لەمێژوودا هەموو قورئـانی پیرۆزی لەبەرکرد.

بزانه ...

ئەو پێغەمبەرەی خودای گەوره کردی به (وەزیر) و له سورەتی فورقاندا باسی دەکات (هارون) پێغەمبەره.

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَا مَعَهُ أَخَاهُ هَارُونَ وَزِيرًا ﴾. الفرقان ٣٥

بزانه ...

ئەمە کۆتا ئایەتی قورئانی پیرۆزه که دابەزیوه:

﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾* البقرة ٢٨١

---

* گەرچی ڕاجیایی هەیه له نێوان زانایان دەربـارەی کۆتـا ئـایەت که دابەزیـوه بـۆ پێغەمبەری خودا ﷺ چوونکه هیچ دەقێکـی یەکـلای کەرەوه و ڕوون و ئاشـکرا نـیه له پێغەمبەری خوداوه سـەبارەت بەکۆتـا ئـایەت که دابەزیوه،بـۆیه زانایـان هەوڵ و تێکۆشانیانداوه بۆ دیاریکردنی کۆتا ئایەت و زۆرینەشـیان ڕایـان وایه ئەم ئـایەتەی سورەتی بەقەره کۆتا ئەیاته کەدابەزیوه.

بزانە ...

لە بەهەشتدا بە دەنگی پێغەمبەر محمدﷺ گوێمان لە قورئان ئەبێت.

بزانە ...

کورترین ئایەتی قورئان بریتیە لە: ﴿مُدۡهَآمَّتَانِ﴾. سورەت الرحمن ٦٤.

بزانە ...

ئایەتی (دین) کە درێژترین ئایەتی قورئانە (٣٣) پیتی (میمی) تێدایە:

سورەتی البقرە: ﴿يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا إِذَاتَدَايَنتُم بِدَيْنٍ...﴾. ٢٨٢

بزانە ...

یەکەم سورەتی قورئانی پیرۆز کە پێغەمبەری خوداﷺ ڕایگەیاند لە مەکەدا بریتیبوو لە: سورەتی (نەجم).

بزانە ...

هەر کەس لەکاتی قورئان خوێندن و زکری خودا و لە پێناوی خودادا بگریت، ئەوا خودای گەورە و میهرەبان لە پاداشتی ئەو فرمێسکانەیدا دۆزەخی لەسەر حەرام دەکات و چاوەکانی دۆزەخ نابین.

بزانە ...

هۆکاری کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لەلایەن خەلیفەی موسوڵمانان (ئەبوبەکر)ی ڕاستگۆوە بەهۆی شەهیدبوونی (٧٠ ) حافظ قورئانەوە بوو لەشەڕی (یەمامە)،ئەمەش ترسی لەناوچوونی قورئانی دروستکرد.

بزانه ...

یەکەم سورەت لە قورئاندا کە دابەزی سورەتی (علقه):

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴾.

بزانه ...

ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان لە (عەسفان) هاتە خوارەوە لە بەینی نیوەڕۆ و عەسردا:

سورەتی النساء:﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ... ﴾. ١٠٢

بزانه ...

سورەتی (نەجم) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئەم ئایەتەی لە مەدینە دابەزیووە:سورەتی نەجم: ﴿ الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ...﴾ ٣٢

بزانه ...

سورەتی (مرسلات) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئایەتێکی لە مەدینە دابەزیوە بریتیە لە: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ ﴾. ٤٨

بزانه ....

پێنج ئایەتی سەرەتای سورەتی (علق) لە ئەشکەوتی (حراء) دابەزی.

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ « ١ »خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ « ٢ »اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ« ٣ » الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ« ٤ » عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ« ٥ » ﴾.

بزانە ...

سورەتی (ق) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئەم ئایەتەی لەمەدینە دابەزیوە:

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ ٣٨

بزانە ...

هەموو حەرامێک خوازراوە (كل ممنوع مرغوب):

﴿...وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾. البقره ٣٥

بزانە ...

سورەتی (یس) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئەم ئایەتەی لە مەدینە دابەزیوە: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ...﴾. ٤٥

بزانە ...

سورەتی (حجر) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئایەتێکی لە مەدینە دابەزیوە بریتیە لە: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِّنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ﴾. ٨٧

بزانە ...

سورەتی (یوسف) نەباسی بەهەشتی تێدایە نە باسی ئاگر.

بزانە ...

ئایەتی (تەیەمووم) دابەزی بۆ پێغەمبەری خودا لە (البقیع) نزیک شاری مەدینەی منەوەرە لە ساڵی شەشەمی کۆچی کاتێک پێغەمبەر دەگەڕایەوە لە غەزای المریسیع (بنی المصطلق).

بزانە ...

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتانە بەهۆی نەهی (ئەبو جەهل) بوو لە (پێغەمبەری خودا ﷺ) تا لە کەعبەدا نوێژ نەکات.

﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ «١٧» سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ «١٨» كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ ۩ ﴾.

العلق ١٩

بزانە ...

سورەتی (سبا) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئایەتێکی لە مەدینە دابەزیوە بریتیە لە: ﴿ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ ﴾. ٦

بزانە ...

سورەتی (الزخرف) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئایەتێکی لە مەدینە دابەزیوە بریتیە لە: ﴿ فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴾. ٥٤

بزانە ...

سورەتی (الجاثیە) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئەم ئایەتەی لە مەدینە دابەزیوە: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ اللَّهِ... ﴾. ١٤

بزانە ...

ئایەتی (حیجاب) لە ساڵی پێنجەمی کۆچی دابەزی:

﴿ ...وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ... ﴾.

النور ٣١

**بزانە ...**

ئەو سورەتەی ناو نراوە سورەتی (بدر) سورەتی (الانفال)ـە.

**بزانە ...**

سورەتی (الروم) سورەتێکی مەکەییە بەڵام ئەم ئایەتەی لە مەدینە دابەزیوە: ﴿ فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴾. ١٧

**بزانە ...**

ئەو ئایەتەی دابەزیە (ناو کەعبە)ی پیرۆز ئەم ئایەتەبوو:

﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا... ﴾. النساء ٥٨

**بزانە ...**

سورەتی مەدینەیی لە سورەتی مەکەیی درێژترە.

**بزانە ...**

ئەو ئایەتەی باسی (ڕۆژوو)ی تیادا هاتووە ئەم ئایەتەیە:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ... ﴾. البقره ١٨٣

**بزانە ...**

دۆزەخ (٧) دەروازەی هەیە و هەر دەروازەیەکیش لە چەند دەرگایەک پێک هاتووە و دۆزەخیانی لێوە ڕاپێچ دەکرێت:

﴿ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴾. الحجر ٤٤

بزانە ...

ئەو سورەتی قورئانی پیرۆز کە هەموو ئایەتەکانی بە پیتی (س) کۆتای دێت بریتیە لە: سورەتی (الناس).

بزانە ...

ژمارەی ئایەتەکانی چوار سورەتی قورئانی پیرۆز (٥) ئایەتە کە بریتین لە: (القدر، الفیل، المسد، الفلق).

بزانە ...

ئەو ژن و پیاوە کافرەی لە ژیاندا مابوون کە خودای گەورە لە سورەتی (المسد)دا حوکمی دان بە کردنە ناو ئاگرەوە کە بریتین لە: پیاوەکافرەکە ئەبو لەهەبە و ژنەکەی ئوم جمیلە.

بزانە ...

ئەو سورەتەی بەناوی پیاو چاکێک و کەسێکی حەکیمەوە ناونراوە کە پێغەمبەر نەبووە: سورەتی (لوقمان)ـە.

بزانە ...

ئەو ئاژەڵەی ڕەتی کردەوە فەرمانی خاوەنەکەی جێبەجێ بکات لە ترسی خودای گەورەی: (فیلەکانی ابرهە)یە.

بزانە ...

ئەو سورەتەی قورئانی پیرۆز کە (هەزار فەرمان و هەزار نەهی و هەزار حوکم و هەزار هەواڵی تێدایە): سورەتی (البقرە)یە.

بزانە ...

سورەتی (الفتح) لە ساڵی شەشەمی کۆچی دابەزی کاتێک پێغەمبەرﷺ دەگەڕایەوە لەشەڕی حودەیبیە.

بزانە ...

ئەو سورەتەی قورئانی پیرۆز کە بە (ئاسودەی بڕواداران) دەسپێدەکات و بە (خەسارەتمەندی بێ بڕوایان) کۆتای دێت سورەتی (المؤمنون)ـە.

بزانە ...

بەناوبانگترین و دیارترین زانستەکانی قورئانی پیرۆز بریتین لە: (التجوید، القراءات، التفسیر، علوم القران).

بزانە ...

ئەو سورەتەی ئەگەر لە جومعەیەکدا بی خوێنیت ئەبێتە (نور) هەتا جومعەی داهاتوو: سورەتی (کەهف)ـە.

بزانە ...

ئەو سورەتانەی قورئانی پیرۆز کە هیچ پیتێکی (ک) تێدا نیە بریتیە لە: (العصر، الفلق، قریش).

بزانە ...

ژمارەی ئەو سورەتانە کە (کاتەکانی وەستان – قل،ج،صل...)ی تێدایە بریتیە لە: (٨٤) سورەت.

بزانه ...

ئەو سوڕەتەی پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی شیفای هەموو دەردێکە سوڕەتی (الفاتحة)یە.

بزانه ...

ئەو ئاژەڵەی چەندەها ساڵ لەگەڵ خاوەنەکەی (خەوت) بریتیە لە: (سەگ). کهف

بزانه ...

ژمارەی (وەستانی قەدەغە — لا) بریتیە لە (٦٨) وەستان لە (٢٢) سوڕەتدا هاتووە.

بزانه ...

ئەو سوڕەتەی قورئانی پیرۆز یەکەم جار سوجدەی تیاهات بریتیە لە: (سوڕەتی النجم).

بزانه ...

ئەو سوڕەتەی دەسپێدەکات بەناوی جۆرێکی (میوە) بریتیە لە: سوڕەتی التین.

بزانه ...

ئەو پێغەمبەرانەی کەمترین جار ناویان هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا بریتین لە: (ذو الکفل، الیسع، الیاس و ادریس).

بزانە ...

ئەو سورەتەی بەناوی (ڕوبار)ێکەوە ناو نراوە: سورەتی کەوسەرە .

بزانە ...

ئەو پێغەمبەرەی لە قورئاندا باسکراوە کەشتی دروستکرد (نوح) بوو.

بزانە ...

ئەو سورەتانەی ژمارەی ئایەتەکان و وەستانەکانیان یەکسانە بریتیە لە:

ئەنفال: ٧٥ ئایەت، ٧٥ وەستان.

یوسف: ١١١ ئایەت، ١١١ وەستان.

ئیبراهیم: ٥٢ ئایەت، ٥٢ وەستان.

بزانە ...

ناوەکانی ئاگر کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون بریتین لە:

(النار، جهنم ، الهاوية ، الحطمة ، سقر ، سعير ، لظي ، السموم).

بزانە ...

ئەو ئاژەڵەی پێغەمبەرێکی لە ناو سکی خۆیدا زیندانی کرد و لە قورئاندا باسکراوە: (نەهەنگە): ﴿فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٞ﴾. الصافات ١٤٢

بزانە ...

ئەو پێغەمبەرەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە کوڕەکەی بێباوەڕبوو:

نوح پێغەمبەربوو (هود ٤٣)

بزانە ...

خودا لە قورئانی پیرۆزدا باسی دەکات شـەیتان لە ئـاگر دروسـتکراوە و لە دەستەی پەریەکانە: ﴿ ...إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ... ﴾. کهف ٥٠

بزانە ...

ژمارەی ئایەتەکانی سورەتە مەکەیەکان بریتیە لە (٤٤٧٠).

بزانە ...

ژمـارەی (وەسـتانی واجـب – م) بـریتیە لە (٢٢) وەسـتان لە (١٣) سورەتدا هاتووە.

بزانە ...

سورەتی (القلم) باسی چیرۆکی ئەم پێغەمبەرانە ئەکات:

(نوح، ابراهم، الیاس، لوط، موسی، یونس).

بزانە ...

خواردنی ئەهلی دۆزەخ ئەمانەن:

دڕکێکی وشک و تفت و تاڵە: ﴿ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴾. الغاشیە ٦

بەری داری ژەقنەموت: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ ﴾. الدخان ٤٣

کانزای تواوە لەناو ورگ و ڕیخۆڵەکاندا دەکوڵێت: ﴿ كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ ﴾. الدخان ٤٥

بزانە ...

لە سورەتی (القصص) باسی چیرۆکی (شەش) پێغەمبەر کراوە کە بریتین لە: (نوح، هود، صالح، لوط ،موسا).

بزانە ...

لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە خودای گەورە قەومی نوحی بە غەرقکردن لە ئاودا لەناوبرد.

بزانە ...

هەموو ساڵێک جوبرەئیل (جارێک) دەوری قورئانی بە پێغەمبەرﷺ دەکردەوە بەڵام ئەو ساڵەی کۆچی دوای کرد (دوو جار) دەوری قورئانی پێکرد.

بزانە ...

ئەو کەسەی کە خۆی و باوکی و باپیری لەگەڵ باوکی باپیری پێغەمبەر بوون بریتیە لە:یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم.

بزانە ...

زۆرترین سورەتی قورئانی پیرۆز لە جوزئی ژمارە (٣٠) دا هاتووە کە پێی دەوترێ جوزئی (عەمە).

بزانە ...

یەکەم خۆراکی ئەهلی بەهەشت کەلە قورئاندا باسکرابێت بریتییە لە: (جەرگی نەهەنگ).

بزانە ...

لە قورئانی پیرۆزدا (٢) جار ناوی مەکە هاتووە جارێک بەناوی (مەکە) و جارێک بەناوی (بکە).

١ – سورەتی الفتح: ﴿...وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ...﴾. ٢٤

٢ – سورەتی آل عمران:﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا...﴾٩٦

بزانە ...

سورەتی (کەوسەر) هیچ پیتێکی (م) تێدا نیە.

بزانە ...

باشترین خۆراک لە قورئاندا ئاماژەی پێکرابێت (هەنگوینە). محمد ١٥

بزانە ...

ئەو دەریایەی لە قورئاندا باسکراوە پێغەمبەر مووسا لێی پەڕیوەتەوە ئێستا پێی دەوترێ: دەریای (سور).

بزانە ...

ملهوڕترین قەوم و زۆرترین پێغەمبەریان لەناو بردووە و ململانێیان لەگەڵ کردووە (جولەکە)ن.

بزانە ..

ئەو سورەتەی زۆرترینی ئایەتەکانی ئاماژەیە بۆ سوێند خواردن سورەتی (الشمس)ـە.

بزانه ...

کەمترین پیت لە قورئانی پیرۆزدا هاتبێت بریتیە لە پیتی (ظ).

بزانه ...

باشترین شەو کە قورئان ئاماژەی پێکردبێت شەوی (قەدرە).

بزانه ...

ئەو میوەیەی زۆرترین جار لە قورئاندا باسکراوە (ترێ)یە.

بزانه ...

باشترین مانگ لە قورئانی پیرۆزدا هاتبێت مانگی ( ڕەمەزانە).

بزانه ...

باشترین کار لای خودا لە قورئانا باسکرابێت (نوێژ)ە.

بزانه ...

ئەم دوو کەسە زۆرترین و مەزنترین عەزاب دەچێژن لە ڕۆژی دوایدا:

١- قابیل:چوونکە کوشتنی داهێنا،یەکەم خوێنی ڕشت،برای خۆی کوشت.*

٢- ئەو کەسەی حوشترەکەی پێغەمبەر سالّحی خەساند کە ئەوە موعجیزەیەکی خودابوو بۆ خزمەتی ئەوانی ناردبوو.

---

* قابیل: یەکەم کوڕی ئادەمە، ئەو برایەی کە کوشتی ناوی هابیلە. تا قیامەت ئەوەی خوێن بڕێژێت بەشێکی تاوانەکەی بۆ ئەویش ئەچێت.

بزانە ...

باشترین خواردنەوە ئاماژەی پێکرابێت لە قورئاندا (شیرە).

بزانە ...

باشترین و بەرزترین شوێنی بەهەشت (فیردەوسـ)ـە.

بزانە ...

بەرزترین شوێنی یەقین (حق الیقینـ)ـە:﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ الْيَقِينِ ﴾ الواقعه ٩٥

بزانە ...

نزیکەی (٦٠) کەسێک هەبوون کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە ژیانی خۆیدا داینابوون بۆ نووسینەوەی قورئانی پیرۆز.

بزانە ...

بچووکترین ئازار بە دایک و باوکتی بگەینی بریتیە لە گووتنی (ئوف).*

﴿... أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ ... ﴾. الاسراء ٢٣

بزانە ...

دەوڵەمەنترین مرۆڤ لە قورئانی پیرۆزدا هاتبێت (قارونـ)ـە.

﴿ إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ...﴾. القصص ٧٦

* بزانە لاوازترین پیتی عەرەبی و سوکترین پیتی عەرەبی پیتی (ف) بۆیە بە لاوازترین وشە و پیت جێی ڕەزامەندی خودا نیە ئازار بەدایک و باوکت بگەیەنی.

بزانه ...

باشترین زکر لای خودا ( خوێندنەوەی قورئانە).

بزانه ...

ئەو کۆمەڵە کەسانەی زۆرترین عەزاب دەبینن لە ڕۆژی دوای بریتین لە:
(دوو ڕووەکان — المنافقون). ﴿ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴾. المطففين ٢٧

بزانه ...

قورئانی پیرۆز دابەشکراوە بۆ سێ بەش کە بریتین لە:
(یەکتاپەرستی خودا، چیرۆک، ئەحکام).

بزانه ...

بزانه ئەو پێغەمبەرەی پیشەی دارتاشی بووە (زەکەریا) بووە.

بزانه ...

ئەو ئاژەڵەی ڕۆڵی هەبوو لە ئاگادارکردنەوەی نەتەوەکەی خۆی لەکاتی بوونی مەترسی جەیشەکەی پێغەمبەر سولەیماندا لە قورئاندا باسکراوە: (مێرولەیە).

بزانه ...

پێغەمبەر دەفەرموێ (زەهراوەین) بخوێنن سورەتی (آل عمران و البقرە) کە لە ڕۆژی دوایدا ئەبنە سێبەر بەسەر سەرتەوە و ئەبنە حوجە (ئەڵێن خودایە نابێ بیسوتێنت منی خوێندوە).

بزانە ...

بچوکترین زیندەوەر لە قورئانی پیرۆزدا هاتبێت (مێشـ)ـە.

بزانە ...

ئەو پێغەمبەرەی لە قوڕ دروستکرابوو (ئادەم) بوو.

بزانە ...

سەیرترین و قورسترین دروستکراوی خودا (زەوی و ئاسمانـ)ـەکانە.

بزانە ...

ئەو باڵندەیەی لە قورئاندا باسکراوە کە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر سولەیمان کردوە: (الهدهد-پەپوە سلێمانکە).

سوڕەتی النمل: ﴿ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ... ﴾. ٢٢

بزانە ...

ئەم سوڕەتانە ناوەکانیان وەر نەگیراوە لە ئایەتەکانەوە بەڵکو بەپێی ماناکانیان ناو نراون:

١- الفاتحە - کرانەوە:چونکە کردنەوەی کتێبی قورئانە و هەموو نوێژێک بەم سورەتە دەسپیدەکات.

٢ — الأنبیاء- پێغەمبەران :چوونکە چیرۆکی زۆربەی پێغەمبەرانی تێدایە.

٣ — الأخلاص- دڵسۆزی :لەبەر مانای دڵسۆزی و یەکبوونی خودا.

بزانە ...

گەورەترین ئاژەڵ لە قورئاندا ئاماژەی پێکرابێت (نەهەنگە).

﴿ فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴾. الصافات ١٤٢

بزانە ...

(پێنج) سورەتی قورئانی پیرۆز بەناوی (ئاژەڵانەوە) هاتووە بریتین لە:

(النحل، البقرة، الفيل، العنكبوت، النمل).*

بزانە ...

مەزنترین موعجیزەی پێغەمبەرمانﷺ (قورئانی پیرۆزە).

بزانە ...

لەو (٢٥) پێغەمبەرەی لە قورئاندا ناویان هاتووە تانها (٤) پێغەمبەریان عەرەبن: ( هود، ساڵح، شوعەیب، محەمەد ﷺ ).

بزانە ...

مەزنترین موعجیزەی پێغەمبەر موسا لە قورئاندا هاتبێت لەتکردنی (دەریا) بوو.

بزانە ...

ئەو مرۆڤەی لە قورئاندا باسکراوە زۆرترین خۆبەزلزانی هەبوو داوای خوایەتی ئەکرد (فیرعەون)بوو.

---

* واتاکانیان بە کوردی (مێشەهەنگ، مانگا، فیل، جاڵجاڵۆکە، مێرووله).

بزانه ...

توخمی ئاسن دابەزێنراوەته ناوەڕاستی زەوی.

سوڕەتی (الحديد – ئاسن)ـیش دەکەوێته ناوەڕاستی قورئان.

۱۱٤÷ ۲= ٥۷.

ناوەڕاستی ژمارەی سوڕەتەکانی قورئان ( الحديد ٥۷).

بزانه ...

ئەو پێغەمبەرەی زۆرترین جار باسکراوه له قورئاندا (موسا)یه.

بزانه ...

جوانترین شار و بەهێزترین قەوم کەله قورئاندا ناوی هاتبێت بریتیه له:

(ارم ذات العماد – قوم عاد)*. ﴿ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴾. الفجر ۷

بزانه ...

مەزنترین موعجیزەی عیسا له قورئاندا باسکرابێ ئەوەیه خودا بۆلای خۆی بەرزی کردەوه.

بزانه ...

ئەم پێغەمبەرانه پێیان دەوترێ (اول العزم – خاوەنی دامەزراوی و خۆڕاگری) :(نوح، ئیبڕاهیم، موسا، عیسا، محمد ﷺ).

*تێبینی: دەسەڵاتدارترین قەوم و بەهێزترین قەومی سەردەمی خۆیان بوون که کۆشک و تەلار و باڵەخانەیان بێوێنه بووه له هەموو وڵاتانی جیهانی ئەو کاته.

بزانه ...

ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی (مێشەهەنگ – النحل) (١٦) کرۆمۆسۆمە وە ژمارەی سورەتی (النحل)یش (١٦) یە.

بزانه ...

ئەو ئاژەڵەی لە قورئاندا باسکراوە و تۆمەتبار کراوە بەکردنی شتێک بەڵام نەیکردبوو:گورگبوو.

ئایەتی تۆمەتبارکردنەکە: ﴿ ...عِندَ مَتَاعِنَا فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ... ﴾. یوسف ١٧

بزانه ...

درەختی نەفرەت لێکراو کە باسکراوە لە قورئانی پیرۆزدا بریتیە لە: درەختی (زەقومە – ژەقنەمووت یان ملعونە).

﴿ ...وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرْآنِ... ﴾. الاسراء ٦٠

﴿ إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ ﴾. دخان ٤٣

بزانه ...

ئەو پیاوەی خودا سوێندی بە گیانی خوارد پێغەمبەر محمدە ﷺ.

﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾. الحجر ٧٢

بزانه ...

ئەو مارەی پێشتر (گۆچانبوو) مارەکەی (موسا)بوو.

سورەتی الأعراف: ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴾. ١٠٧

بزانە ...

ئەو دوو سورەتەی بە هەمان ئایەت کۆتایان دێت بریتین لە:

سورەتی (الحاقە و الواقعە). ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾.

بزانە ...

ئەو دارانەی بەهەشت کە ناویان هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا بریتین لە:

(داری نەمری – شجره الخلد) : ﴿...شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ﴾. طە ١٢٠

(سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ – سیدرەتو لموتنتەها) : ﴿عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ﴾ نجم ١٤

بزانە ...

لە قورئانی پیرۆزدا سێ جۆر نەفس باسکراوە بریتین لە:

١- نەفسی باش موطمەئینە: ﴿يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ «٢٧»ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی "ئەی ئادەمیزادی ژیر و هۆشمەند کە لە تەمەنی کۆتای دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست"... ﴾. الفجر

١ – نەفسی مامناوەند لوامە: ﴿وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ «٢»سوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو و نەفسی ڕەخنە لە خۆگر کە لۆمەی خۆی دەکات﴾. القیامە

٣ – نەفسی خراپ ئەمارە بیسوء: ﴿...إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ... «٥٣» چونکە بەڕاستی نەفس زۆر فەرماندەرە بەگوناهو هەڵەو تاوان﴾ یوسف

بزانە ...

ئەو پیتەی بەکار نەهاتوە لە ناوی هەر (١١٤) سورەتەکەی قورئان بریتیە لە پیتی (ظ).

بزانە ...

زۆرترین ژمارە لە قورئانی پیرۆزدا دووبارە بوو بێتەوە ژمارە (یەک)ـە پاشان ژمارە (حەوت)ـە.

بزانە ...

ئەو ڕوبارانەی باسکراون لە قورئانی پیرۆزدا کە ئاونین، ڕوباری (شیر و شەڕاب و هەنگوین)ن.

﴿ ...وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ...﴾. محمد ١٥

بزانە ...

یەکەم ژمارە کەهاتووە لە (موصحەفی قورئاندا) لە سورەتی بەقەرەیە ژمارە (حەوتە): ﴿ ...ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ...﴾. ٢٩

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز ناوەکانیان پێچەوانەی یەکن:

(المؤمنون – کافرون) (جن – الناس) ( الشمس – القمر).*

---

* ( باوەڕدار – بێباوەڕ) (جنۆکە – ئادەمیزاد) (خۆر – مانگ).

بزانه ...

یەکەم (امر – فەرمان) دابەزی لە قورئانی پیرۆز ئەم ئایەته بوو:

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾. علق ١

بزانه ...

ژمارەی ئەو فریشتانەی سەر پەرشتی (دۆزەخ) دەکەن (١٩) فریشتەن.

﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾. المدثر ٣٠

بزانه ...

ئەو سورەتەی پێی دەوترێ سورەتی (نساء) بریتیه لە: (ممتحنه).

بزانه ...

ئەو ئافرەتەی لە قورئاندا باسکراوە داوای لە خودای میهرەبان کرد ماڵێکی لە بەهەشت لەتەک خۆی بۆ دروست بکات بریتیه لە:

( ئاسیای کچی مزاحم- هاوسەری فیرعەون).

﴿ ...امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ... ﴾. التحريم ١١

بزانه ...

ئەو ئایەتەی تێیدا خودا دەفەرموویێت محمد ﷺ کۆتا پێغەمبەری خودایە:

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ ...﴾.

الاحزاب ٤٠

**بزانە ...**

خودای گەورە فەرمانی کردوە بەخوێندنەوەی قورئان بەلەسەرخۆی و ڕێکوپێکی و تەجویدەوە: ﴿ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴾. المزمل ٤

**بزانە ...**

ئەو پێغەمبەرەی لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە قەڵغانی دروستەکرد: (پێغەمبەر داود)ـە .

**بزانە ...**

لە قورئاندا باسکراوە ناخۆشترین دەنگ دەنگی زەڕینی گوێدرێژە: سورەتی لوقمان: ﴿ ...إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴾.١٩

**بزانە ...**

ئەم ئایەتە بەئایەتی (گەڕانەوە بۆ لای خودا) ناسراوە:

﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾. زمر ٥٣

**بزانە ...**

ئەو پیاوەی وەسفی لە قورئاندا هاتووە کە ژنەکان پێی دەڵێن بەشەر نیە و تەنها فریشتەیەکی جوان و بەڕێزە بریتیە لە:

پێغەمبەر یوسف: ﴿ ...وَقُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٞ كَرِيمٞ ﴾ یوسف ٣١

بزانه ...

ئەم ئـــایەتە بـــاس لە حەوت مانگـــای قەڵەو و حەوت مانگـــای لاواز وە حەوت گوڵی دانەوێڵەی سەوز و حەوت گوڵی دانەوێڵەی وشک دەکات:

﴿...فِي سَبْعِ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنبُلَاتٍ خُضْرٍ...﴾ يوسف ٤٦

بزانه ...

ئەو فریشـــتەیەی ئەمینـــی خـــودایە و وەحـــی قورئـــانی دابەزانـــد بـــۆ پێغەمبەرﷺ جوبرەئیلە بە کۆڕای موفەسیران:

١ – شعراء: ﴿ وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ «١٩٢» نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴾.

٢ – نحل: ﴿قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا...﴾. ١٠٢

بزانه ...

ئەو ئایەتەی هەموو چاکە و خراپەی تێدا کۆ کراوەتەوە بریتیە لە:

﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ نحل –٩٠

بزانه ...

درێژترین وشەی قورئانی پیرۆز کە ژمارەی پیتەکانی (١١) پیـتە بـریتیە لە وشەی ﴿ فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ ﴾.

﴿ ... فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ ﴾. الحجر ٢٢

بزانە ...

ئەو باڵندەیەی کە مرۆڤی فێری مردوو ناشتن کرد (قەلەڕەشـ)ـە:

﴿ فَبَعَثَ اللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي الْأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءَةَ أَخِيهِ...﴾ المائدە ٣١

بزانە ...

پێغەمبەر ئیلیاس لە قورئانی پیرۆزدا ناوی بە (الیاس و الیاسین) هاتووە کە ئێستا گۆڕەکەی لە وڵاتی لوبنانە:

﴿ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ ﴾. الصافات ١٣

﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾. الصافات ١٢٣

بزانە ...

لە قورئانی پیرۆز لە سورەتی (الاعراف)دا چەند دیمەنێکی حەساسی ڕۆژی قیامەت باسەکات لەوانە ڕوداوەکانی نێوان سێ گروپ:

(گروپی باوەڕداران هاوڕێیانی بەهەشت) (گروپی هیدایەت و ئیمان)

(گروپی بێ بڕوایان و هاوڕێیانی دۆزەخ کە کەسانی گومڕا و زاڵمن).

بزانە ...

پێغەمبەری خودا ﷺ بەوتنی ئەم ئایەتە بتەکانی کەعبە و دوروبەری لەناوبرد: ﴿ وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾. الإسراء ٨١

هەروەها بڵێ: تازە حەق و ڕاستی هاتووەو بەرپا بووەو بەتاڵ و ناحەقی، پووچ و تەفرو توونا بووە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەرتیاچووە و جێگیر نەبووە و بەزیووە.

بزانە ...

تاکە ئایەتە باسی (دوو مزگەوت) ئەکات لە سورەتی (الاسراء) کە بریتین لە:﴿...أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَى...﴾ ١

بزانە ...

لاوازترین ماڵ لە قورئاندا باسکرابێت ماڵی جاڵجاڵۆکەیە.

﴿ ...كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗا ...﴾. العنكبوت ٤١

بزانە ...

ئەو پێغەمبەرەی خودا ئاسنی بۆنەرمکرد پێغەمبەر داود بوو.

﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضۡلٗاۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيۡرَۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ﴾ سبا ١٠

بزانە ...

ئەو سێ ئاژەڵەی لە قورئاندا ناویان هاتووە کە هۆی ڕازانەوەن و بۆ سواریش بەکاربێن بریتین لە: ئەسپ و ماین و گوێدرێژ.

﴿ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ...﴾. النحل ٨

بزانە ...

﴿ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم بِنَهَرٖ...﴾. بقره٢٤٩

ئەم ڕووبارەی لەم ئایەتەدا باسدەکرێت ابن عباس دەڵێت: ئەوە ڕووباری بەینی فەلەستین و ئەردەنە و ئاوێکی سازگار و شیرینە.

بزانە ...

ئەم ئایەتە باسی پارانەوەی ئادەم دەکات لە خودای گەورە تا لێی خۆشبێت: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾. الأعراف ٢٣

بزانە ...

ئەو سورەتانەی بەناوی کاتەکانی نوێژەوەن بریتین لە:
(الفجر- بەرەبەیان) و (الضحى -چێشتەنگاو) و (العصر-عەسر).

بزانە ...

ئەم سورەتە پیرۆزەی قورئان دابەزی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ لە حەجی ماڵئاوای لە ناوەڕاستی ڕۆژانی تشریق:
سورەتی النصر: ﴿ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ﴾.

بزانە ...

جیاوازی کۆکردنەوەی قورئان لەسەردەمی خەلیفە (ئەبوبەکر و عوسمان) ئەوەیە کە لەسەردەمی ئەبوبەکردا قورئان لە نوسراوی سەر پێستە و ئێسقانەوە کۆکرایەوە گواسترایەوە بۆ یەک کتێب بەهۆی (ترسی لەناوچوونەوە) بەڵام لە سەردەمی خەلیفە عوسماندا چەند دانەیەک لەو قورئانە کۆکراوەی ئەبوبەکر کۆپی کرا و نێردرا بۆ وڵاتە جیاوازەکانی دەوڵەتی ئیسلام بەهۆی دروستبوونی (جیاوازی لە خوێندنەوەی قورئاندا).

بزانە ...

ئەم ئایەتەی خودای گەورە (١٦) پیتی (میمی) تێدایە:

﴿ قِيلَ يَانُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ مِّنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾. هود ٤٨

بزانە ...

لە قورئاندا (پێنج) سورەت دەسپێدەکەن بە (قل) بریتین لە:

١ – سورەتی الكافيرون: ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾.

٢ – سورەتی الأخلاص: ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾.

٣ – سورەتی الفلق: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾.

٤ – سورەتی الناس: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾.

٥ – سورەتی الجن: ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ ... ﴾.

بزانە ...

لە قورئانی پیرۆزدا (چوار) سورەت دەسپێدەکەن بە﴿إِنَّا﴾:

١ – سورەتی الكوثر: ﴿ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ﴾.

٢ – سورەتی القدر: ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ ﴾.

٣ – سورەتی نوح: ﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ ... ﴾.

٤ – سورەتی الفتح: ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴾.

**بزانه ...**

**ئەم دوو ئایەتە دابەدوای یەک دێـن خـودای گەورە (٨) جـار دووبـارەی کردۆتەوە لە سورەتی (شعراء).**

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ«٨» وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ «٩»﴾

**بزانه ...**

**لە هەموو قورئاندا لە یەک ئایەتدا دوو جار وشەی (الله) دووبارە بۆتەوە دوا بەدوای یەک لە:** ﴿... مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ ...﴾ الأنعام ١٢٤

**بزانه ...**

**مەبەست لە شارانە چیە لەم ئایەتانەدا ؟**

﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ ... ﴾. البقره ٢٥٩

﴿ وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ ... ﴾. الأعراف ١٦٣

﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَهَا إِيمَانُهَا ... ﴾. یونس ٩٨

﴿ فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا ... ﴾. کهف ٧٧

**١ – مەبەست لە شارەکەی ئایەتی بەقەرە (بیتل مقدس)ـە .**

**٢ – مەبەست لە شارەکەی ئایەتی آل عمران (ایلة).**

**٣ – مەبەست لە شارەکەی ئایەتی یونس (نەینەوا لە عێراق).**

**٤ – مەبەست لە شارەکەی ئایەتی کهف (بورقە).**

**بزانە ...**

**لەیەک شوێنی قورئاندا وشەی (بَقِيَّة) بە تائی کراوە هاتووەلە:**

**سورەتی هود: ﴿ بَقِيَّتُ اللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ ... ﴾. ٨٦**

**بزانە ...**

**دوو سورەتی قورئان کۆتایان هاتوە بە ناوی سورەتەکە خۆی:**

**١ – سورەتی المسد: ﴿ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴾. ٥**

**٢ – سورەتی الماعون: ﴿ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ ﴾. ٧**

**بزانە ...**

**بزانە لە هەموو قورئاندا یەک ئایەت هەیە پێک هاتووە تەنها لە ( پەروەردگار و دووبرا کە پێغەمبەرن) ئەویش لە سورەتی الاعرافە.**

**﴿ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَارُونَ ﴾ ١٢٢ (کە پەروەردگاری موسا و هاروونە).**

**بزانە ...**

**ئەم سورەتانەی قورئان دەسپێدەکەن بەناوی سورەتەکە خۆی:**

**١ – الحاقە: ﴿ الْحَاقَّةُ « ١ » مَا الْحَاقَّةُ ﴾.**

**٢ – القارعە: ﴿ الْقَارِعَةُ « ١ » مَا الْقَارِعَةُ ﴾.**

**٣ – الرحمن: ﴿ الرَّحْمَٰنُ « ١ » عَلَّمَ الْقُرْآنَ ﴾.**

**٤ – عبس: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ « ١ » أَن جَاءَهُ الْأَعْمَىٰ ﴾.**

بزانە ...

لە قورئاندا (دوو) سورەت بە﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ﴾دەسپێدەکەن:

١ – سورەتی النساء: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم ...﴾.

٢ – سورەتی الحج: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ ...﴾.

بزانە ...

لە یەک ئایەتی قورئانی پیرۆزدا وشەی (ابنة) بە تائی کراوە هاتووە ئەویش: سورەتی التحريم: ﴿ وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ ...﴾. ١٢

بزانە ...

لە هەموو قورئانی پیرۆزدا لە حەوت شوێندا وشەی (امراة) بە تائی کراوە هاتووە ئەویش بریتیە لە مانە:

١ – سورەتی آل عمران: ﴿ إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ... ﴾. ٣٥

٢ – سورەتی یوسف: ﴿ ...امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا ... ﴾. ٣٠

٣ – سورەتی یوسف: ﴿ ...قَالَتِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ...﴾ ٥١

٤ – سورەتی القصص: ﴿ وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ... ﴾. ٩

٥ – سورەتی التحريم: ﴿ ...امْرَأَتَ نُوحٍ... ﴾. ١٠

٦ – سورەتی التحريم: ﴿ ...وَامْرَأَتَ لُوطٍ... ﴾. ١٠

٧ – سورەتی التحريم: ﴿ ...امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ... ﴾. ١١

بزانه ...

له هەموو قورئانی پیرۆزدا له پێنج شوێندا وشەی (سنة) به تائی کراوه هاتووه ئەویش بریتیه له مانه:

١ — سورەتی الأنفال: ﴿ ...فَقَدۡ مَضَتۡ سُنَّتُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾. ٣٨

٢ — سورەتی فاطر: ﴿ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾. ٤٣

٣ — سورەتی فاطر: ﴿... فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ... ﴾. ٤٣

٤ — سورەتی فاطر: ﴿ ...وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ﴾. ٤٣

٥ — سورەتی غافر: ﴿... سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦ... ﴾. ٨٥

بزانه ...

پێنج له پێغەمبەران ئیدانەی کەمی لەخوا ترسانی قەومەکانی خۆیان کردوه و هەموویان پێیان وتوون ﴿ أَلَا تَتَّقُونَ) که بریتین له: نوح و هود و صالح و لوط و شوعەیب.

١ — سورەتی الشعراء: ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾. ١٠٦

٢ — سورەتی الشعراء: ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾. ١٢٤

٣ — سورەتی الشعراء: ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾. ١٤٢

٤ — سورەتی الشعراء: ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾. ١٦١

٥ — سورەتی الشعراء: ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾*. ١٧٧

* - هەموشیان له سورەتی (الشعراء)دا باسکراوه.

بزانە ...

لە قورئاندا ئەم دوو ئایەتە کە دەربارەی قورئانن هاوشێوەن:

١ – سورەتی الزخرف: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾. ٣

٢ – سورەتی یوسف: ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾. ٢

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز بەوشەی (قد) دەسپێدەکەن:

١ – سورەتی المؤمنون: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴾.

٢ – سورەتی المجادله: ﴿ قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ... ﴾.

بزانە ...

لە یەک سورەتی قورئاندا وشەی (لولا) حەوت جار دووبارە بۆتەوە لە (حەوت) ئایەتدا بۆ ئەوەی ماناو مەبەستی ئایەتەکان تێکبدات.

١ – سورەتی النور: ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ... ﴾. ١٠

٢ – سورەتی النور: ﴿ لَّوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ ... ﴾. ١٢

٣ – سورەتی النور: ﴿ لَّوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا... ﴾. ١٣

٤ – سورەتی النور: ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا ... ﴾. ١٤

٥ – سورەتی النور: ﴿ وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ... ﴾. ١٦

٦ – سورەتی النور: ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ... ﴾. ٢٠

٧ – سورەتی النور: ﴿ ...وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ... ﴾. ٢١

بزانه ...

له سورەتی بەقەرەدا چوار جار باسی (گوێرەکه) کراوە:

١ – سورەتی البقره: ﴿ ...ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِن بَعْدِهِ وَأَنتُمْ ظَالِمُونَ ﴾. ٥١

٢ – سورەتی البقره: ﴿ ...ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ... ﴾. ٥٤

٣ – سورەتی البقره: ﴿ ... مُّوسَىٰ بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ ...﴾. ٩٢

٤ – سورەتی البقره: ﴿ ...وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ... ﴾. ٩٣

بزانه ...

(سێ) سورەت کۆتایان هاتوە بەناوی سورەتەکە خۆی:

١ – سورەتی المسد: ﴿ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴾. ٥

٢ – سورەتی الماعون: ﴿ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ ﴾. ٧

٣ – سورەتی الناس: ﴿ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴾. ٦

بزانه ...

پێغەمبەران یەک پەیامیان گەیاندووە و هەمان مەبەستیان هەیە، (پێنج) پێغەمبەر هەمان شت بەقەومەکەیان ئەڵێن کە لە سورەتی شوعەرائدا باسکراون بریتین لە: نوح و هود و صاڵح و لوط و شوعەیب.

﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾.

الشعراء (١٠٩،١٢٧،١٤٥،١٦٤،١٨٠)

بزانه ...

ئەو (دوو) سورەتەی دەسپێدەکەن بە ( طسم ) بریتین لە:

سورەتی الشعراء: ﴿ طسم «١» تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴾.

سورەتی القصص: ﴿ طسم «١» تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴾.

بزانه ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز دەسپێدەکەن بە وشەی (اقترب):

١ – سورەتی الأنبياء: ﴿ اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴾.

٢ – سورەتی القمر: ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴾.

بزانه ...

ئەم سورەتانە بەشێوەیەک ڕێکخراون دوو ئایەتی سەرەتا یان دەسپێکردنیان وەکو یەکن:

١ –سورەتی القصص و الشعراء:﴿طسم «١» تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴾

٢ – سورەتی الزخرف و الدخان: ﴿ حم «١» وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴾.

٣ - سورەتی الحشر و الصف: ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾.

٤ –سورەتی الجاثيه و الأحقاف:﴿ حم «١» تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾.

بزانە ...

لە یەک ئایەتی قورئانی پیرۆزدا وشەی (جنـة) بە تـائی کـراوە هـاتووە ئەویش: سورەتی الواقعة: ﴿ فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ ﴾. ٨٩

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز دەسپێدەکەن بە وشەی (التبارک):

١ – سورەتی الملک: ﴿ تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾.

٢ – سورەتی الفرقان: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ ... ﴾.

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز دەسپێدەکەن بە چوار پیت لە پیتە پچڕ پچڕەکان:

١ – سورەتی الأعراف: ﴿ المص «١» كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي ... ﴾.

٢ – سورەتی رعد: ﴿ المر تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ ... ﴾.

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز بە ( دوعا ) دەسپێدەکەن:

١ – سورەتی المطففين: ﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴾.

٢ – سورەتی الهمزە: ﴿ وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ﴾.

٣ – سورەتی المسد: ﴿ تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ﴾.

بزانه ...

له سورەتی بەقەردا (سێ) ڕەنگ هاتوون که بریتین له:

ڕەنگی زەرد: ﴿ ... إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ﴾. ٦٩

ڕەنگی ڕەش: ﴿... يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ...﴾. ١٨٧

ڕەنگی سپی: ﴿... يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ...﴾. ١٨٧

بزانه ...

له ئایەتی (٣٦)ی سورەتی (المؤمنین) لەو ئایەتەدا دوو جار و دوابەدوای یەک وشەی (هَيْهَاتَ) هاتووە و له هەموو قورئانی پیرۆزدا تەنها لەو ئایەتەدا ئەو وشەیە هاتووە بە تائی کراوە و بەو شێوەیە:

﴿ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴾

بزانه ...

ئەو سورەتەی بە (سبح-یادی خودا) دەسپێدەکات و هەر بەیادی خوداش کۆتای دێت (الحشر):

سورەتی الحشر دەسپێکردن: ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾. ١

سورەتی الحشر کۆتایهاتنی: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ يُسَبِّحُ ... ﴾. ٢٤

بزانه ...

له یەک ئایەتی قورئانی پیرۆزدا وشەی ﴿ قُرَّة ﴾ به تـائی کـراوه هـاتووه ئەویش له: سورەتی القصص: ﴿... فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ ...﴾. ٩

بزانه ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز دەسپێدەکەن به وشەی (لا اقسم):

١ – سورەتی القيامه: ﴿ لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾.

٢ – سورەتی البلد: ﴿ لَا أُقْسِمُ بِهَٰذَا الْبَلَدِ ﴾.

بزانه ...

له قورئانی پیرۆزدا سێ سورەت به ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ ﴾ دەسپێدەکەن:

١ – سورەتی التحريم: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ ...﴾.

٢ – سورەتی الطلاق: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ...﴾.

٣ – سورەتی الأحزاب: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ ...﴾.

بزانه ...

له سورەتی بەقەرەدا ئایەتێک (دوو) جار دووباره بۆتەوه بەهەمان پیت و وشه و دەق،که بانگەشەکانی جولەکەی هەڵوەشاندەوه:

سورەتی البقره: ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾. ١٣٤،١٤١

بزانە ...

(١٢) جار لە سورەتی (التكوير) ئیسمی شرطی (اذا) دووبارە بۆتەوە بە بێ ئەوەی مانا و مەبەستی ئایەتەکان تێکبدات.

بزانە ...

لە دوو ئایەتی قورئاندا وشەی (معصية) بە تائی کراوە هاتووە لە:

١ – سورەتی المجادلە: ﴿ ... بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ ...﴾. ٨

٢ – سورەتی المجادلە: ﴿ ... تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ ...﴾ ٩

بزانە ...

(حەوت) سورەتی قورئانی پیرۆز بە (سبح – یسبح –سبحان) تەسبیحات–یادی خودای گەورە دەسپێدەکەن بریتین لە:

١ – سورەتی الاعلى: ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾.

٢ – سورەتی الأسراء: ﴿ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا ...﴾.

٣ – سورەتی التغابن: ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ... ﴾.

٤ – سورەتی الجمعە: ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ ﴾.

٥ – سورەتی الصف: ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ﴾.

٦ – سورەتی الحشر: ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ... ﴾.

٧ – سورەتی الحديد: ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ ... ﴾.

بزانە ...

لە یەک ئایەتی قورئاندا وشەی (فطرة) بە تائی کراوە هاتووە لە:

سورەتی الروم: ﴿ فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ... ﴾. ٣٠

بزانە ...

لە دوو ئایەتی قورئاندا وشەی ( شجرة ) بە تائی کراوە هاتووە لە:

١ - سورەتی الدخان: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴾. ٤٣

٢ - سورەتی الواقعة: ﴿ءَأَنتُمۡ أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ﴾. ٧٢

بزانە ...

لە هەموو قورئانی پیرۆزدا لە حەوت شوێندا وشەی (رحمة) بە تائی کراوە هاتووە ئەویش بریتیە لە مانە:

١ – سورەتی البقره: ﴿...أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ...﴾. ٢١٨

٢ – سورەتی الأعراف: ﴿...إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾. ٥٦

٣ – سورەتی هود: ﴿...رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ... ﴾. ٧٣

٤ – سورەتی مریم: ﴿ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴾. ٢

٥ – سورەتی الروم : ﴿فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ ...﴾. ٥٠

٦ – سورەتی الزخرف: ﴿أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَ ...﴾. ٣٢

٧ – سورەتی الزخرف: ﴿...وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴾. ٣٢

بزانە ...

تاکە ئـایەتی پیـرۆزی قورئـان کە دەسـت پێـدەکات بە پیتـی (ظ) ئەم ئایەتەی سورەتی ڕۆمە: ﴿ ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ... ﴾. ٤١

بزانە ...

وەک ئاشکرایە قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوە و کتێبێکی عەرەبیە و دابەزیـوە بـۆ نـاو نەتەوەی عەرەب، کە شـێواز و دەق و نووسـین و ڕەوانبێـژی و ڕێزمـانی عەرەبـیە و بەهـیچ شـێوەیک دژ نـیە و ئەو دەقە قورئانیانەی باسی ئەمە دەکەن بریتین لە:

١ – سورەتی النحل: ﴿... وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ﴾. ١٠٣

٢ – سورەتی الشعراء: ﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴾. ١٩٥

٣ – سورەتی یوسف: ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾. ٢

٤ – سورەتی رعد: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ... ﴾. ٣٧

٥ – سورەتی طه: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا ... ﴾. ١١٣

٦ – سورەتی الزمر: ﴿ قُرْآنًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ... ﴾. ٢٨

٧ – سورەتی فصلت: ﴿ كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ... ﴾. ٣

٨ – سورەتی الشوری: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا ... ﴾. ٧

٩ – سورەتی الأحقاف: ﴿... وَهَٰذَا كِتَابٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا ... ﴾. ١٢

١٠ – سورەتی الزخرف: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾. ٢

**بزانە ...**

**ئەمە تاکە ئایەتی قورئانە کە دەست پێدەکات بە پیتی (د):**

﴿ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴾. الصافات ٩

**بزانە ...**

هەموو پێغەمبەر و نێردراوان یەک نامەیان گەیاندوە ئەویش ئەوەیە تەنها خودا بپەرست و هیچ شەریک و هاوەڵێکی بۆ پەیدا نەکەن، وە لەسورەتی (الأعرافدا) خوای گەورە (چوار) پێغەمبەرمان بۆ باس دەکات کە بە نەتەوەکانی خۆیان وت:

﴿ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ _ خوا بپەرستن چونکە جگە لەو خوایەکی ترتان نیە ﴾ ئەو پێغەمبەرانە بریتین لە:

پێغەمبەر شوعەیب: ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ قَدْ ... ﴾ ٨٥

پێغەمبەر صالح: ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ...﴾ ٧٣

پێغەمبەر هود: ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ... ﴾ ٦٥

پێغەمبەر نوح: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ... ﴾ ٥٩

بزانە ...

لەیەک ئایەتی قورئانی پیرۆزدا وشەی (العنة) بە تائی کراوە هاتووە لە:

١ – سورەتی آل عمران: ﴿... فَنَجْعَل لَّعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾. ٦١

٢ – سورەتی النور: ﴿وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ...﴾. ٧

بزانە ...

لە هەموو قورئانی پیرۆزدا لە یانزە شوێندا وشەی (نعمة) بە تائی کراوە هاتووە ئەویش بریتیە لە مانە:

١ – سورەتی البقره: ﴿... وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ...﴾. ٢٣١

٢ – سورەتی آل عمران: ﴿... وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ...﴾. ١٠٣

٣ – سورەتی المائده: ﴿... اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ ...﴾. ١١

٤ – سورەتی ابراهیم: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا ...﴾. ٢٨

٥ – سورەتی ابراهیم: ﴿... وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ...﴾. ٣٤

٦ – سورەتی النحل: ﴿...وَبِنِعْمَتِ اللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ﴾. ٧٢

٧ – سورەتی النحل: ﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ...﴾. ٨٣

٨ – سورەتی النحل: ﴿... وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ ...﴾. ١١٤

٩ – سورەتی لقمان: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ ...﴾. ٣١

١٠ – سورەتی فاطر: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ...﴾. ٣

١١ – سورەتی الطور: ﴿فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ﴾. ٢٩

بزانه ...

له هەموو قورئانی پیرۆزدا دوو پیتی (دد) بەیەکەوە له وشەیەکدا تەنها (٣٢) جار هاتووە*.

بزانه ...

خودای گەورە هەموو پێغەمبەرانی بەناوی خۆیانەوە بانگ کردوو بۆ نمونه:یا نوح، یا موسا،جگە له پێغەمبەر محمدﷺ کە بەناوی پێغەمبەر یان پەیامبەر ناوی هێناوە، خودای گەورە (١٣) جار بە پێغەمبەر ناوی هێناوە و (٢)جاریش بە پەیامبەر له سورەتەکانی:

١ – سورەتی الأنفال: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ...﴾. ٦٤

٢ – سورەتی الأنفال: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ... ﴾. ٦٥

٣ –سورەتی الأنفال: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّمَن فِي أَيْدِيكُم مِّنَ... ﴾ ٧٠.

٤ – سورەتی توبە: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ... ﴾. ٧٣

٥ – سورەتی الأحزاب: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ... ﴾. ١

٦ – سورەتی الأحزاب: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ...﴾. ٢٨

---

*لەبەر زۆری ئایەتەکان و بێزارنەبوونی خوێنەر بەکورتی لێرەدا ئاماژەیان پێدەکەین: (البقره:٢١٧)، (التوبة:٦٣:٤٥)، (یونس:٥:٨٨)، (الحجر:١٩)، (النحل:٩٤)، (ص:٢٠) (الاسراء:٦:١٢)، (الكهف:١١:٣٦:١٠٩)، (مریم:٧٥)، (طه:٣١)، (الحج:١٥)، (المؤمنون:١١٢) (القصص:١٣)، (سبا:٣٢)، (فاطر:٢٧)، (ق:٧)، (الطور:٢٢)، (نوح :١٢) (الجن:١١:٢٤:٢٨)، (الانسان:٢٨)، (التین:٥)، (الهمزة:٢:٩)، (ال عمران:١٢٥).

٧ - سورەتی الأحزاب: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا... ﴾. ٤٥

٨ – سورەتی الأحزاب: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ ... ﴾. ٥٠

٩ – سورەتی الأحزاب: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ ... ﴾. ٥٩

١٠ – سورەتی المائدە: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن ... ﴾. ٦٧

١١ – سورەتی طلاق: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ... ﴾. ١

١٢ – سورەتی التحريم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ ... ﴾. ١

١٣ – سورەتی التحريم: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ ... ﴾. ٩

١٤ – سورەتی المائدە: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ الَّذِينَ ... ﴾. ٤١

١٥ –سورەتی الممتحنه:﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ ... ﴾. ١٢

بزانە ...

ئەم سورەتانەی قورئانی پیرۆز دەسپێدەکەن بە دوو پیت:

١ – سورەتی غافر: ﴿ حم « ١ » تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ... ﴾.

٢ – سورەتی فصلت: ﴿ حم « ١ » تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾.

٣ – سورەتی الشوری: ﴿ حم « ١ » عسق ﴾.

٤ – سورەتی الزخرف: ﴿ حم « ١ » وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴾.

٥ – سورەتی الدخان: ﴿ حم « ١ » وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴾.

٦ – سورەتی الجاثيه: ﴿حم « ١ » تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ... ﴾.

٧ – سورەتی الأحقاف: ﴿ حم « ١ » تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ... ﴾.

٨ – سورەتی طه: ﴿ طه« ١ » مَاأَنزَلْنَاعَلَيْكَالْقُرْآنَلِتَشْقَىٰ ﴾.

٩ – سورەتی یس: ﴿ يس« ١ » وَالْقُرْآنِالْحَكِيمِ ﴾.

١٠ – سورەتی النمل: ﴿ طستِلْكَ آيَاتُالْقُرْآنِوَ كِتَابٍمُّبِينٍ ﴾.

بزانە...

لە قورئانی پیرۆزدا (١٥) سورەت دەسپێدەکەن بە (سوێند):

١ – سورەتی الذاریات: ﴿وَالذَّارِيَاتِذَرْوًا«١»سوێند بەو بایانەی کە زۆر شت پرژو بڵاودەکەنەوە﴾.

٢ – سورەتی الطور : ﴿وَالطُّورِ « ١»سوێند بەکێوی _ طور ﴾.

٣ – سورەتی النجم: ﴿وَالنَّجْمِإِذَاهَوَىٰ « ١»سوێند بە ئەستێرە کاتێ ئاوا دەبێ ﴾.

٤ – سورەتی المرسلات: ﴿وَالْمُرْسَلَاتِعُرْفًا «١»سوێند بە بای ڕەوانە کراوی، یەک لە دوای یەک﴾.

٥ – سورەتی النازعات: ﴿وَالنَّازِعَاتِغَرْقًا «١»سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی کافران دەردەهێنن﴾

٦ – سورەتی البروج: ﴿وَالسَّمَاءِذَاتِالْبُرُوجِ «١»سوێند بە ئاسمانی خاوەن ئەستیرە ﴾.

٧ – سورەتی الطارق: ﴿وَالسَّمَاءِوَالطَّارِقِ «١»سوێند بەو ئەستێرانەی بەشەودا دەردەکەون ﴾.

٨ – سورەتی الفجر:﴿وَالْفَجْرِ «١»سوێند بە بەرەبەیان ﴾.

٩ – سورەتی اللیل:﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ «١»سوێند بە شەو کاتێک دنیا دادەگرێت ﴾.

١٠ – سورەتی الضحی:﴿وَالضُّحَىٰ «١»سوێند بە چێشتەنگاو ﴾.

١١ – سورەتی التین:﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ «١»سوێند بە هەنجیرو زەیتوون﴾

١٢ – سورەتی العادیات:﴿وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحًا «١»سوێند بەوانەی کە تیژڕەون و ناڵەیان لێوە دێت ﴾.

١٣ – سورەتی العصر:﴿وَالْعَصْرِ «١»سوێند بە زەمانە، سوێند بەکاتی عەسر ﴾.

١٤ – سورەتی الصافات:﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا «١»سوێند بە فریشتە ڕیز بووەکان ﴾.

١٥ – سورەتی الشمس:﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا «١»سوێند بە خۆر و تیشکی خۆر کە لە سەرەتایی ڕۆژدا سەرهەڵدەدا ﴾.

بزانە ...

خودای گەورە لە سورەتێکدا سوێند دەخوات بە (١١) شت دوابەدوای یەک،لە هەموو قورئاندا نمونەیەکی تری وەک ئەمە نیە ئەویش سورەتی (الشمس) ئایەتی (١-٧).

﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴾ ١ (سوێند بە خۆر و تیشکی خۆراکە لە سەرەتایی ڕۆژدا سەرهەڵدەدا).

﴿ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴾ ٢ (سوێند بە مانگ، کاتێک بەشوێنیدا دێت).

﴿ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴾ ٣ (سوێند بە ڕۆژ کاتێک کە خۆر دەردەخات).

﴿ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ﴾ ٤ (سوێند بە شەو کە خۆر دادەپۆشێت.

﴿ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ﴾ ٥ (سوێند بە ئاسمان و بەو زاتە بە دەسەڵاتەی دروستی کردووە).

﴿ وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا ﴾ ٦ (سوێند بە زەوی و بەو زاتەی کە بەشێوەی هێلکەیی دایناوە).

﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴾ ٧ (سوێند بە دەروون و ئەو زاتەی کە بە ڕێک و پێکی بەدیهێناوە.*

بزانە ...

لە حەوت ئایەتی قورئاندا وشەی (کلمة) بە تائی کراوە هاتووە لە:

١ – سورەتی النساء: ﴿... وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ...﴾. ١٧١

٢- سورەتی الاعراف: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ الْحُسْنَىٰ ﴾. ١٣٧

٣ – سورەتی الانعام: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ...﴾. ١١٥

٤ – سورەتی یونس: ﴿كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ ...﴾. ٣٣

٥ – سورەتی یونس: ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ...﴾. ٩٦

٦- سورەتی الصافات: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ﴾. ١٧١

٧ – سورەتی غافر: ﴿وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ ...﴾. ٦٠

---

* تێبینی بکە: هەر حەوت ئایەتەکە بە (و) دەسپێدەکەن و بە (اها) کۆتاییان دێت.

بزانە ...

ژماردن و ژمارەکان لە قورئانی پیـرۆزدا کـراون بە هەشـت بەشـەوە بەم شێوانەی خوارەوە.

**ا_تاک ژمارەکان- یەک تا ١٠ ...**

- ژمارە یەک (١) ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ... ﴾. البقرة ١٦٣
- ژمارە دوو (٢) ﴿... لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ ... ﴾. النحل ٥١
- ژمارە سێ (٣) ﴿... وَلَا تَقُولُوا ثَلَاثَةٌ انتَهُوا ... ﴾. النساء ١٧١
- ژمارە چوار (٤) ﴿ فَسِيحُوا فِي الْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ ... ﴾. التوبة ٢
- ژمارە پێنج (٥) ﴿... وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ ... ﴾. الكهف ٢٢
- ژمارە شەش (٦) ﴿ ... وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ... ﴾. الأعراف٥٤
- ژمارە حەوت (٧) ﴿ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ ...﴾. الحجر ٤٤
- ژمارە هەشت (٨) ﴿ ... عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ ﴾. الحاقة ١٧
- ژمارە نۆ (٩) ﴿ وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ ... ﴾. النمل ٤٨
- ژمارە دە (١٠) ﴿... تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ... ﴾. البقرة ١٩٦

**ب- دەیان- دوو ژمارە.**

- ژمارە یانزە (١١) ﴿... إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا ... ﴾ يوسف ٤
- ژمارە دوانزە (١٢) ﴿ إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ ... ﴾ التوبة ٣٦
- ژمارە نۆزدە (١٩) ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴾ المدثر ٣٠

**ت_ دەیان- ئەو ژمارانەی دە دە زیادەکەن.**

- ژمارە بیست (٢٠) ﴿... إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ ... ﴾ الأنفال ٦٥
- ژمارە سی (٣٠) ﴿... وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا ... ﴾ الأحقاف ١٥
- ژمارە چل (٤٠) ﴿ وَإِذْ وَاعَدْنَا مُوسَىٰ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ .... ﴾ البقرة ٥١
- ژمارە پەنجا (٥٠) ﴿ ... فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا ...﴾ العنكبوت ١٤
- ژمارە شەست (٦٠) ﴿... فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ... ﴾ المجادلة ٤
- ژمارە حەفتا (٧٠) ﴿ ... ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴾ الحاقة ٣٢
- ژمارە هەشتا (٨٠) ﴿ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً... ﴾ النور ٤
- ژمارە نەوەت (٩٠) ﴿ إِنَّ هَٰذَا أَخِي لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً ... ﴾ ص ٢٣

**ت-سەدان - سێ ژمارەی.**

- ژمارە سەت (١٠٠) ﴿... قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ ... ﴾ البقرة ٢٥٩
- ژمارە دوو سەت (٢٠٠) ﴿ ...صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ... ﴾ الأنفال ٦٥
- ژمارە سێ سەت (٣٠٠) ﴿ وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ .... ﴾ الكهف ٢٥

**ج- هەزاران - چوار ژمارەی.**

- ژمارە یەک هەزار (١٠٠٠) ﴿ ... مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا ... ﴾ الأنفال ٦٦
- ژمارە دووهەزار (٢٠٠٠) ﴿... يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ...﴾ الأنفال٦٦
- ژمارە سێ هەزار (٣٠٠٠) ﴿ ...بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِّنَ ... ﴾ آل عمران ١٢٤
- ژمارە پێنج هەزار (٥٠٠٠) ﴿... رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلَافٍ...﴾ آل عمران ١٢٥

**ح- هەزاران- شەش ژمارەی.**

➢ سەد هەزار ( ١٠٠٠٠٠) ﴿ وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ... ﴾ الصافات ١٤٧

**خ- بەشەکان- ئەو ژمارانەی ئاماژە بە بەشەکان ئەدەن.**

➢ ژمارە یەک لەسەر دوو (١/٢) ﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ... ﴾ النساء ١٢

➢ ژمارە سێ لەسەر یەک (١/٣) ﴿ ...فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ... ﴾ النساء ١١

➢ ژمارە چوار لەسەر یەک (١/٤) ﴿ ...الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ... ﴾ النساء ١٢

➢ ژمارە پێنج لەسەر یەک (١/٥) ﴿ ... شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ... ﴾ الأنفال ٤١

➢ ژمارە شەشە لەسەر یەک (١/٦) ﴿ ...فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ... ﴾ النساء ١١

➢ ژمارە هەشت لەسەر یەک (١/٨) ﴿... الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم... ﴾ النساء ١٢

➢ ژمارە دە لەسەر یەک (١/١٠) ﴿... مِعْشَارَ مَا آتَيْنَاهُمْ ...﴾ سبا ٤٥

**د - کۆمەڵێ ژمارەی تایبەتی تر- ژمێردراو.**

➢ یەکەم ﴿... إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ... ﴾ الأنعام ١٤

➢ دووەم ﴿ ... إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ... ﴾ التوبة ٤٠

➢ سێیەم ﴿ إِذْ أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمُ اثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ... ﴾ یس ١٤

➢ چوارەم ﴿ ...مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ... ﴾ المجادلة ٧

➢ پێنجەم ﴿ وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴾ النور ٧

➢ شەشەم ﴿... وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِالْغَيْبِ... ﴾الكهف ٢٢

➢ هەشتەم ﴿ ... وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ... ﴾ الكهف ٢٢

بزانە ...

ئەم ناوانەی ( یوم القیامـة – ڕۆژی زینـدووبونەوە) لە قورئـانی پیـرۆزدا هاتوون:

١– ڕۆژی دوای: ﴿... مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ... ﴾. البقرە ١٧٧

٢ – قیامەت: ﴿... حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا ...﴾. الأنعام ٣١

٣ – ڕۆژی داخ و خەفەت: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ﴾ مریم ٣٩

٤– ڕۆژی زیندووبونەوە: ﴿... كِتَابِ اللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ الْبَعْثِ...﴾. الروم ٥٦

٥ – ڕۆژی جیاکردنەوە: ﴿هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُم... ﴾. الصافات ٢١

٦ – ڕۆژی بەیەک گەیشتنەوە: ﴿...مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ﴾غافر ١٥

٧ – ڕۆژە نزیکەکە: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى ... ﴾غافر ١٨

٨ – ڕۆژی لێپرسینەوە:﴿ ... كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ﴾. غافر ٢٧

٩ – ڕۆژی هاوار و ئاهونالە: ﴿ ... أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ ﴾. غافر ٣٢

١٠ – ڕۆژی کۆکردنەوە: ﴿ ... حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ ... ﴾. الشوری ٧

١١ – ڕۆژی پێشهاتنی هەڕەشەو ئاگادارکردنەوە:﴿يَوْمُ الْوَعِيدِ ﴾. ق ٢٠

١٢ – ڕۆژی نەمری و نەبڕاوەیی: ﴿ ... بِسَلَامٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ ﴾. ق ٣٤

١٣ – ڕۆژی هاتنەدەرەوە لە توێی خاکدا: ﴿... يَوْمُ الْخُرُوجِ﴾. ق ٤٢

١٤ – ڕوداوە گەورەکە: ﴿ إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ ﴾. الواقعە ١

١٥ – ڕۆژی زیان باری: ﴿ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ... ﴾. التغابن ٩

١٦ – ڕۆژی حەق و ڕاستیەکان: ﴿ الْحَاقَّةُ« ١ »مَا الْحَاقَّةُ ﴾. الحاقه ١

١٧ – ئەو گرمەیەی دڵەکان دائەخورپێت: ﴿ ... بِالْقَارِعَةِ ﴾. الحاقه ٤

١٨ – بەڵا گەورەکە: ﴿ فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَىٰ ﴾. النازعات٣٤

١٩ – دەنگی بەهێزی گوێ کپ کەر: ﴿ فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ ﴾. عبس ٣٣

٢٠ – داپۆشەر: ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ ﴾. الغاشيه ١

❊❊❊

## (نووسینەکان)

بزانە...

دڵەکان تەنها بەیادی خودا ئارام دەبن.

بزانە...

ئەگەر دەتەوێت بەباشترین شێوە خودا بناسیت؟

ئەوا بە باشترین شێوە بچۆ خزمەتی قورئان.!

بزانە...

قورئان خوێندن !!

گفتوگۆی نێوان خۆت و خودایە.

بیربکەرەوە!!

لەکەیەوە ئەو گفتوگۆیەت پچڕاندووە.

بزانە...

حەسەنی بەصری دەفەرمووێت لە (٩٠) شوێنی قورئانی پیرۆزدا خوێندوومەتەوە کە خودای گەورە گەرەنتی ڕسق و ڕۆزی بەندەکانی دەکات، لەیەک شوێنی قورئاندا خوێندوومەتەوە کە شەیتان بەهەژاری ئەتان ترسێنێت،ئێمە بڕوا بە بەڵێنە ڕاستەکەی خودا ناکەین،کەچی باوەڕ بە درۆکەی شەیتان ئەکەین.

بزانه ...

سورەتی علق به (اقرء – بخوێنه)دەستی پێکردوو به (واسجد واقترب – سوژدەبەره و نزیک بەرەوە) كۆتای هات.

خوێندنەوە دەبێت ئاوابێت،بخوێنەوە تا نزیک بیتەوە و بگەیت پێی،بخوێنەوە تا بزانی تەماو مەبەستی چیه و ئەخلاق و خوی دینەكەی بگریت، بخوێنەوە تا بەدوای هیدایەت بگەڕێی و ڕابكەی له گومڕای،بخوێنیتەوە تا خشوع و ملكەچیت زیادبكات.

خوێندنەوەكەت ڕووت و ڕەجاڵ مەكە له ڕێنمونی و ئیمان،بەڵكو بخوێنه بەناوی پەروەردگارتەوە. (د.احمد عبد المنعم)

بزانه ...

یوسف ئەستس: دەڵێن ئیسلام بەزەبری شمشێر بڵاو بۆتەوە من هەموو قورئانم خوێندەوە یەک جار وشەی شمشێرم بەدی نەكرد.

بزانه ...

خـــودای گەورە و میهرەبـــان له (ســـورەتی فـــاطر ئـــایەتی ٢٩)دا دەفەرمووێـت: ئەوانەی قورئـان دەخـوێنن بەئومێـدی بازرگـانیەكن كه زەرەر ناكات و تیاناچێت و لەناو ناچێت كه پاداشتی خودای گەورەیه و مسۆگەره.

كەواته هەمیشه بەردەوام به له بازرگانی كردن لەگەڵ خودادا

بزانە...

مامۆستا (عبدلکریمی مودریس) ئەگەر قورئان لەسەر زەوی هەمووی ئاو ببیات ئەتوانم هەمووی بنوسمەوە بێ ئەوەی شەدەیەکم لەبیربچێت.

هەوڵدە قورئان لەبەرکردنەکەت بە باشترین شێوەبێت.

بزانە...

- قورئان بە جوبرەئیلدا نێردرایە خوارەوە، بۆیە ئەو باشترینە لە نێوان مەلائیکەتەکاندا!

-قورئان بۆ موحەممەد پێغەمبەرﷺ هاتە خوارەوە، بۆیە بووەتە سەرداری مرۆڤایەتی.

-قورئان بۆ ئوممەتی موحەممەد هاتە خوارەوە، بۆیە باشترین ئوممەتن.

-قورئان لە مانگی ڕەمەزاندا هاتوەتە خوارەوە، بۆیە باشترینی مانگەکانە.

-قورئان لە شەوی قەدردا دابەزێنراوە، بۆیە خێری ئەو شەوە لە هەزار مانگ زیاترە.

ئەوە تۆماری گەورەیی ئەوان بە هۆی قورئانەوە، ئەی ئەگەر هەر یەکەمان ئەو قورئانە دابەزێنینە نێو دڵەکانمانەوە، ئاخۆ دڵەکانمان چی لێ دێت؟ ئەگەر ئەو قورئانە لە ڕەوشتماندا ڕەنگ بداتەوە، ئاخۆ ڕەوشتمان چۆن دەبێت؟ ئەگەر ئەو قورئانە لە گوفتارماندا ڕەنگ بداتەوە، ئاخۆ گوفتارمان چۆن بێت؟ دەی با قورئان بکەینە نزیکترین هاوڕێ و هاودەمی شەو و ڕۆژمان.

بزانە ...

خودای گەورە بە بەندەکانی فەرمـوو: (لَا تَقْنَطُوا– بێ ئومێد مەبن).

پێغەمبەر یوسف بەبراکەی فەرمووو: (فَلَا تَبْتَئِسْ–دڵگران مەبە).

پێغەمبەر شوعەیب بە پێغەمبەر موسای وت: ( لَا تَخَفْ– مەترسە).

پێعەمبەر محمد بە ئەبوبەکری وت: ( لَا تَحْزَنْ– خەفەت مەخۆ).*

کەواتە ئەگەر ئەمە قسەی خودای گەورە و پێغەمبەرەکانی بن تۆ بۆچی ئەترسیت و خەم دەخۆیت.

بزانە ...

دەروناسێک دەڵێت هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا سەردانم دەکەن جگە لە ئەهلی قورڕان خوێنان نەبێت.

قورئان بخوێنە و ئارامی دەروون بەدەست بێنە.

بزانە ...

حەسەنی بەصری فەرموویەتی :(چۆن دڵت نەرم ئەبێ بە قورئان خوێندنەوە لەکاتێکدا هەموو خەمت ئەوەیە بگەیت بەکۆتای سورەتەکە).

بزانە ...

ڕوحت پێویستی بەقورئانە، وەک چۆن سیەکانت پێویستیان بەهەوایە.

---

* (الزمر ٥٣، یوسف ٦٩، القصص ٢٥، التوبە ٤٠)

بزانە ...

(قورئانێک، بەرماڵێک، سوجدەیەک) باشترین ئەو شتانەن  کە مرۆڤ پێویستی پێیانە بۆ دڵخۆشبوون.

❊❊❊

# (ئیعجازی ژمارەیی قورئان)

بزانە...

ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان یەکێکە لە موعجیزە هەرە گەورەکانی خودای گەورە کە بە درێژای زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵە تەحەدای هەموو مرۆڤایەتی دەکات و بەردەوامیشی دەبێت تا قیامەت کە بتوانن وەک بچوکترین سورەتی ئەم قورئانە دروست بکەن، بێگوومان ناشتوانن.*

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ البقرە ٢٣

واتە: جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد ﷺ ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەک ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

---

*تێبینی: بێگومان ئیعجازی قورئان زۆر زۆرە و لە هەموو بواریکدا ئیعجاز هەیە بەڵام ئەوەی من زیاتر لەم بەشەدا گرنگیم پێداوە ئیعجازی ژمارەییە، "ئیعجازی ژمارەی شتێکی تازە نیە، (٨٦) کتێبی کۆن هەیە لەسەر ئیعجازی ژمارەی لەوانە: (کتاب العدد) لعطاء بن یسار (ت ١٠٣) هیجریە. (زهر الغرر فی عدد آیات السور) لاحمد السلمی الاندلسی (ت ٧٤٧ هیجریة)". مامۆستا شەماڵ موفتی

بزانە ...

لە قورئاندا ئاماژە بەوە کراوە کە هاوڕێیانی ئەشکەوت (٣٠٩) ساڵ لە ئەشـکەوتەکەدا خەوتـوون، لەوانەیە کەسـانێک هەبـن گومانیـان لەم ژمارەیەبێـت بەڵام پـاش ئەوەی دکتـۆر( عبـد الـدائم الكحـل) لێکۆڵینەوەیکی کرد بۆی دەرکەوت کە لەسەرەتای سورەتەکەدا خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا﴾. ١٢

(تا بزانین کام دەستەیەیان دەزانن کە چەندە بەخەو لێکەوتووی مانەوە).

وتم پاک و بێگەردی بۆ خودا (٣٠٩) ساڵ مانەوە؟

چیرۆکەکە بە مانەوە دەسپێدەکات و بە مانەوە کۆتای دێت، بۆیە ئەبێت ژمارەی وشەکان چەند بێت؟

بۆیە هەستام بە ژماردنی وشەکان لە مانەوەی یەکەم (لَبِثُوا – ١٢) تا مانەوەی دووەم (وَلَبِثُوا – ٢٦) بۆم دەرکەوت ژمارەی وشەکانیان (٣٠٩) وشەیە هەمان ژمارەی ساڵەکانی مانەوەی یارانی ئەشکەوتە.

وە کاتێک وشەکانم ئەژمارد گەشتمە ﴿ثَلَاثَ مِائَةٍ﴾ وشەی (٣٠٠ ساڵ مانەوە) ڕێک ژمارەی وشەکان (٣٠٠) وشەبوو.

پاک و بێگەردی بۆ دروستکەری جیهانیان ئایا ئەکرێت ئەمە نووسینی مرۆڤێک بێت کە خوێندەواری نیە؟!

بزانە...

یەکێکی تر لە موعجیزەکانی قورئان ئەوەیە زۆرترین وشە لە قورئانی پیرۆزدا دوو بارە بۆتەوە وشەی (الله)یە کە (٢٦٩٩) جار دوو بارە بۆتەوە بە تەحەداوە لە هەموو مرۆڤایەتیدا هیچ نوو سەرێک نیە و نەبووە کتێبێک بنووسێت زۆرترین وشەی دوو بارەبووەی کتێبەکەی ناوی نووسەرەکە خۆی بێت! وە ژمارەی (٢٦٩٩) ژمارەیەکەی یەکتاکیە و بەسەر هیچ ژمارەیەکی تردا دابەش نابێت جگە لە خۆی یان ژمارە یەک وەک ئەوە وایە خودای میهرەبان پێت بڵێت خاوەنی ئەم کتێبە تاک و تەنهایە.وە زۆرترین ژمارە لە قورئانی پیرۆزدا دوو بارە بوو بێتەوە ژمارە (١) کە (٣٣) جارە. کەواتە زۆرترین وشەی دووبارە بووە (الله)یە و زۆرترین دووبارە بوونەوەی ژمارە (١ )، وەک ئەوە وایە پێت بفەرمووێت (الله) خودای تۆ تاک و تەنهایە، بێ شەریک و هاوەڵە.

بزانە...

وشەی (هامان) لە هیچ کتێبێکی دینی و مێژووی پێش قورئاندا ئاماژەی پێنەکراوە تەنها لەم دوا دوایەدا ئەوە ڕوون بووەوە کە لەسەر لەوحەیەکی کۆنی میسری هەڵکۆڵراوە و نوسراوە کە (هامان) گەورەی بیناسازان بووە و ئیشی دروستکردی بینا و تەلارسازی بووە لە کاتێکدا قورئان (١٤٠٠) ساڵە زیاتر ئاماژەی پێکردوە.

(فیرعەون وتی ئەی هامان کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە بەڵکو بگەمە ئەو ڕێگایانە) ٣٦.

سورەتی غافر: ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَا هَامَانُ ابۡنِ لِي صَرۡحًا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ الۡأَسۡبَابَ﴾ ٣٦ [*]

بزانە ...

هەروەک ئاشکرایە ڕووگە و قیبلەی ئێمەی موسوڵمان کەعبەی پیرۆزە و بۆ نوێژەکانمان ڕووی تێدەکەین، ئەگەر موسوڵمان حەجی کرد کۆی ئەو تەواف و سوڕانەوەی کە واجبە لەسەری ئەنجامیان بدات (٧) تەوافە بەدەوری کەعبە و قیبلەدا. ئەوەی کە لێرەدا جێی سەرنجە وشەی (قیبلە)ش لە هەموو قورئاندا (٧) جار خودای گەورە ناوی هێناوە!

١-﴿... مَا تَبِعُوا قِبۡلَتَكَ ...﴾البقرة-١٤٥

٢- ﴿...وَمَا أَنتَ بِتَابِعٍ قِبۡلَتَهُمۡ...﴾ البقرة - ١٤٥

٣-﴿... وَمَا بَعۡضُهُم بِتَابِعٍ قِبۡلَةَ...﴾ البقرة - ١٤٥

٤-﴿ ... وَمَا جَعَلۡنَا الۡقِبۡلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيۡهَا...﴾البقرة - ١٤٣

٥- ﴿...فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةً تَرۡضَاهَا...﴾البقرة - ١٤٤

٦- ﴿...عَن قِبۡلَتِهِمُ الَّتِي كَانُوا عَلَيۡهَا ...﴾البقرة - ١٤٢

٧- ﴿... وَاجۡعَلُوا بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةً وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ...﴾ يونس-٨٧

پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری زانا و کاربەجێ.[١]

---

[*] لە کورتە وتارێکی مامۆستا هاوڕێوە، (هاوڕێی قیامەت).

[١]- پەیجی شیخ احمد کاکە محمود

بزانە ...

وشـەی (الربـا – سـوو) لە قورئـانی پیـرۆزدا (٨) جـار هـاتووە وە لە حەوت جاریاندا وشـەی ڕیبـا پیتـی (واو)ێکـی زیـادەی لەگەڵە چـوونکە ئەسـڵی وشـکە (یربـو) موراعـاتی زمـانەوانی وشـەکەکراوە و لە ڕووی ماناشەوە واتـا زیادکردن (سـوو زیـادکردنی مـاڵە بە شـێوەیەکی حەرام) بەڵام تەنهـا لەیەک شـوێندا ئەو پیتـی (و) زیـادەی پێـوە نـیە کە لەو شوێنەدا خودای گەورە دەفەرمووێت زیاد ناکات.

﴿وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ...﴾. الروم ٣٩

(هەر پارەو سامانێکتان بە سوو دابێت بە خەڵکی بۆ ئەوەی زیاد بکات لـەناو سـامانەکەیاندا، ئـەوە زیـاد ناکـات و پاداشـتی نابێـت لای خـوا (بەڵکو موحاسەبەشی لە دوایە)، ئەوەش بە زەکات داوتانەو مەبەسـتان ڕەزامەنـدی خوایـە، ئـا ئـەو جـۆرە کەسـانە پاداشـتیان چەنـد بەرامبـەر کردۆتەوە).

نمونە بۆ ئەوەی زیاد ئەکات.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا الرِّبَوٰا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾. آل عمران ١٣٠

(ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە سـوو بەچەنـد قـات وچەنـد بەرامبـەر مەخۆن ، لە خوا بترسن، بۆ ئەوەی سەرفراز بن).*

*- تێبینی هەندێک لە موسحەفەکان ئەو واوە نە نوسراوە چوونکە ناخوێندرێتەوە.

بزانە ...

کۆمەڵێک توێژەر هەڵسان بە کردنی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز بەدوو بەشەوە: قورئانی پیرۆز (١١٤) سورەتە ئەگەر بیکەین بە دوو بەش واتا (٥٧) بە (٥٧).

**یەکەم:** متجانس ( ژمارە/ ڕیزبەندی) سورەتەکە وەک کۆی ئایەتەکانێتی، واتا هەردووکیان تاکن یان هەردووکیان جووتن.

بۆ نمونە سورەتی (فاتیحا) ژمارە (یەک)ـە و کۆی ئایەتەکانی (٧) ئایەتە، سورەتی (البقرە) ژمارە (دووە) و کۆی ئایەتەکانی (٢٨٢) ئایەتە.

**دووەم:** غیر متجانس (ژمارە/ ڕیزبەندی) سورەتەکە پێچەوانەی کۆی ئایەتەکانە.

توێژەرەکان هەستان بەدەرکدرنی متجانس واتا ئەو سورەتانەی ژمارەکەی و کۆی ئایەتەکەی یان هەردووکیان تاکن یان هەردووکیان جووتن.ئەگەر جیاواز بوون پێیان دەوترێ غەیر متجانس.

بۆیان دەرکەوت لە نیوەی یەکەمی قورئان واتا (٥٧) سورەتی سەرەتا:

٢٩ سورەتیان غیر متجانسە.

٢٨ سورەتیان متجانسە.

نیوەی دووەمی قورئان واتا (٥٧) سورەتی دووەم:

٢٩ سورەتی متجانسە.

٢٨ سورەتی غیر متجانسە.

کۆی سورەتە متجانسەکان (٢٨ + ٢٩ = ٥٧).

کۆی سورەتە غیر متجانسەکان (٢٩+٢٨=٥٧).

ئەگەر بێین کۆی (ژمارە/بەڕیزبەندی) هەموو سورەتەکان کۆبکەینەوە بۆنمونە: (١+٢+٣+٤+٥+٦+٧........ ١١٤)= ٦٥٥٥

کۆی ژمارەی هەموو ئایەتەکانی قورئان (٦٢٣٦).

کۆی ژمارەی سورەتە متجانیسەکان و کۆی ئایەتەکانیان= ٦٢٣٦

کۆی ژمارەی سورەتە غیر متجانسەکان و ژمارەی ئایەتەکانیان =٦٥٥٥

کۆی ئایەت لە (سورەتە جوت ئایەتەکان) لە نیوەی یەکەمدا (٢٦٩٠) ئایەتە.

کۆی ئایەت لە (سورەتە تاک ئایەتەکان) لە نیوەی دووەمدا (٢٦٩٠) ئایەتە.*

بزانە...

﴿سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَاءً ظَاهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا﴾. ٢٢

ژمارەی وشەکانی ئەم ئایەتەی سوڕەتی کەهف (٣٣) وشەیە.

ئەو ژمارانەشی لە ناو ئایەتەکە هاتوون (٣،٤،٥،٦،٧،٨) کۆی کەیتەوە دەکاتە (٣٣) ئایەتەکەش لە (٣٣) وشە پێک هاتووە..

* شەماڵ موفتی، ئیعجاز لە قورئانی پیرۆزدا بەشی یەکەم.

بزانە ...

پێغەمبەرﷺ لە دایک بووە لە ساڵی فیل کە ئەکاتە (٥٧١–٥٧٠ز) و لەتەمەنی (٤٠) ساڵیدا وەحی بۆ هاتۆتە خوارەوە و (١٣) ساڵ لەمەکە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردوە و لە ساڵی سیانزەیەمدا کۆچی کرد بۆ مەدینە،لەو کاتەی کە پێغەمبەری خواﷺلە مەککە دەرکرا لە رێگا ئاوڕی دایەوەو فەرمووی: (ئەی مەککە تۆ خۆشەویستترین شاری لای خوای گەورە، وە لای منیش، وە ئەگەر هاوبەشبڕیاردەران دەریان نەکردمایە هەرگیز دەرنەدەچووم).

خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ الَّتِي أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَاهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ﴾. محمد ١٣

سەیری ئەو ئیعجازە بکە ئەیایەتەکە ڕێک لە سوڕەتی محمد هاتوە کە بەناوی پێغەمبەر خۆیەوەیەتی و ڕێک لە ئایەتی (١٣) هاتووە کە ساڵی سیانزەیەمی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و ساڵی کۆچکردن لەمەکەیە بۆ مەدینە.

بزانە ...

میسالۆندیز مادەیەکە مێشکی مرۆڤ دەری دەکات لە تەمەنی (١٥) بۆ (٣٥) ساڵی پاشان تا (٨) ساڵی کەمتر دەری دەکات، کەمادەیەکی پرۆتینیە و کبریتی تێدایە و دەتوانرێت بەئاسانی لەگەڵ زەنک و ئاسن و فسفۆڕدا تێکەڵ بکرێت. ئەو مادەیە زۆر گرنگە بۆ جەستەی مرۆڤ و

بەشدار دەبێت لە بەرگری کردن لە نیشانەکانی پیربوون و دڵ بەهێز دەکات و هەناسەدان ڕێک دەخات. زانایان لەم مادەیان کۆڵیوەتەوە تەنها لە دوو جۆر ڕوەکدا هەیە ئەویش زەیوت و هەنجیرن، دوای ئەوەی گوشراوی میسالۆندیز ئامادەکرا دەرکەوت کەتەنها بەکار هێنانی یەکێکیان سودی نابێت و بەڵکو ئەو کاتە سودی ئەبێت کە گوشراوی هەردووکیان تێکەڵ بکرێت ئەویش بە ڕێژەی یەک هەنجیر و حەوت زەیتون، ئەوەش لەگەڵ ئەو ڕێژەیە یەک دەگرێتەوە کە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە،چوونکە لە قورئانی پیرۆزدا لەیەک شوێندا باسی هەنجیر و لەحەوت شوێندا باسی زەیتون کراوە.*

بزانە...

لە قورئانی پیرۆزدا (١٣) جار ناوی زەوی هاتووە و (٣٢) جاریش ناوی دەریا هاتووە، ئەگەر کۆیان بکەینەوە دەکاتە (٤٥).

ئەگەر بێت و (١٣) دابەشی (٤٥) بکەین دەکاتە (٨٩ ,٢٨٪) کە ئەمەش ڕێژەی وشکانیە لەسەر زەوی.

ئەگەر بێت و (٣٢) دابەشی (٤٥) بکەین ئەوا دەکاتە ( ١١ ,٧١٪) کە ئەوەش ڕێژەی ئاوە لەسەر زەوی.

زاناکان تازە بەتازە گەیشتونەتە ئەم ژمارانە لە کاتێکدا لە قورئاندا زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵە ئەم بابەتە هاتووە.

---

* - تێبینی لە قورئاندا شەش جار وشەی زەیتون هاتوە لەگەڵ یەک جار داری زەیتون، ڕاپۆرتی کەناڵی (nrt٤).

بزانه ...

وشەی (السبیل – ڕێگا) کاتێک مەنصوب بێت یەک فەتحەی ئەوێت ئەبێتە (السبیلاً)و هەموو جارێک واهاتووە (کاتێک مەصوب بووە) لە قورئانی پیرۆزدا تەنها لە (یەک) جاردا نەبێت لەگەڵ فەتحەکەدا ئەلیفێکیشی بۆ زیادکراوە بووە بە (السبیلاَ) چوونکە لەم ئایەتەدا باسی کردار ناکات و باسی حاڵە کاتێکی دیاریکراوی کەسانێکی بێ بڕوا ئەکات کە فڕێدراونەتە ناو چاڵی دۆزەخەوە، لەو کاتەدا ئەگرین و سەیری سەرەوە دەکەن و هاوارەکەن و دەنگ درێژەکەنەوە بۆیە ئەو ئەلفەی پێدراوە بەو وشەیە کەمەدی هەیە واتا درێژەکریتەوە دەلالەتەکات لەو هاوار و دەنگ درێژکردنەوەیە .

﴿وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴾.الاحزاب ٦٧

وە دەڵێ: ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە بە گوێی سەران و گەورەکانمان کرد ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین.*

بزانه ...

بێگومان هەموومان بەم سورەتەی قورئانی پیرۆز ئاشناین و ڕۆژانە لە نوێژەکانماندا ئەیخوێنین ئایا ئەم ئیعجازەشمان زانیوە لەسەری؟

سورەتی فاتیحە لە (٧) ئایەت و (٢٩) وشەو (١٤٣) پیت پێک هاتووە، ئەمەی خوارەوە سورەتەکەیە:

---

*- وشەی (السبیل) لە قورئانی پیرۆزدا (١٧٥) جار هاتووە . www. Elkhabar .com

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ «١» الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ «٢» الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ «٣» مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ «٤» إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ «٥» اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ «٦» صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ «٧»﴾

**ئێستا ئێمە دێین یەکەم وشەی هەموو ئایەتەکان وەردەگرین کە پێک دێن لە: (بِسْمِ- الْحَمْدُ- الرَّحْمَٰنِ- مَالِكِ- إِيَّاكَ- اهْدِنَا- صِرَاطَ).**

**کۆی ژمارەی پیتەکانی ئەم وشانە (٣١) پیتە.**

**ئەم جارە وشەی دووەمی ئایەتەکان کۆ دەکەینەوە:**

(اللَّهِ- لِلَّهِ- الرَّحِيمِ- يَوْمِ- نَعْبُدُ- الصِّرَاطَ- الَّذِينَ).

**کۆی پیتەکانی ئەم وشانە (٣١) پیتە.**

**ئەم جارە وشەی سێیەمی ئایەتەکان کۆدەکەینەوە:**

(الرَّحْمَٰنِ- رَبِّ- ٠ - الدِّينِ- وَإِيَّاكَ- الْمُسْتَقِيمَ- أَنْعَمْتَ).

**کۆی پیتەکانی (٣١) پیتە لە کاتێکدا لە ئایەتی سێهەم وشەی سێهەمان نیە. ئێستا با هەر سێ کۆمەڵە وشەکە بهێنین و لە شتێکی تر. بڕوانن:**

بِسْمِ- الْحَمْدُ- الرَّحْمَٰنِ- مَالِكِ- إِيَّاكَ- اهْدِنَا- صِرَاطَ

اللَّهِ- لِلَّهِ- الرَّحِيمِ- يَوْمِ- نَعْبُدُ- الصِّرَاطَ- الَّذِينَ

الرَّحْمَٰنِ- رَبِّ- ٠ - الدِّينِ- وَإِيَّاكَ- الْمُسْتَقِيمَ- أَنْعَمْتَ

**هەر یەک لەم کۆمەڵە وشانە (٣١) پیتە و هەر سێ کۆمەڵەکەش پێکەوە (٣١) خاڵیان هەیە (نقطە).**

لە سورەتی فاتیحادا سێ ناوی خودا هاتووە (٦) جار کە ئەمانەن:

﴿اللهِ- الرَّحْمَٰنِ- الرَّحِيمِ- لِلَّهِ- الرَّحْمَٰنِ- الرَّحِيمِ﴾.

کۆی ژمارەی پیتەکانی ئەم وشانە (٣١) پیتە.

خۆ ئەگەر دەسبکەیت بە ژماردنی ئایەتەکان و بچینە ئایەتی (٣١) ئەبینین ژمارەی خاڵەکانی ئەم ئایەتەش (٣١) خاڵە.

﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾[1]. البقره ٢٤

بزانە...

ئیعجازی قورئان لەسورەتی قەدر دا، سورەتی قەدر (٣٠) وشەیە قورئان لە (٣٠) جزء پێک هاتوە، (١١٤) پیتە قورئان لە (١١٤) سورەت پێک هاتوە، وشەی (هی) واتا ئەو شەوە لەڕیزبەندی وشەکاندا ژمارە (بیست و حەوت)ـە کەئاماژەیە بۆ شەوی قەدر کەلای زۆربەی زانایان ئەکەوێتە شەوی (٢٧).

وشەی قەدر (٣) جار دوبارە بۆەتەوە لەڕیز بەندی وشەکاندا ژمارە ٥ و ١٠ و ١٢ یە

١٢+ ١٠+ ٥ = ٢٧ ئەویش ئاماژەیەکی تر.

---

[1] - (٧ ئایەتی فاتیحە+ ٢٤ ئایەتی البقرە = ٣١ ئایەت کە ئەکاتە ئایەتی ژمارە (٢٤) لە موصحەفدا). ئەم بابەتە وەرگیراوە لە دکتۆر احمد محمد زین المناوي.

(٣) جار ليلة القدر دوبارە بوەتەوە کە لە (٩) پيت پێک دێت:

٩ * ٣ = ٢٧ ئەويش ئاماژەيەکی تر.

بزانە...

ئيعجازی قورئانی لە بچوکترين سورەت (الکوثر)!

بـۆچی خـوای گەورە تەحەددای هەمـوو خەڵکـی ئەکـات کە بتـوانن نموونەی وەک ئەم سورەتە کورتە بهێنن؟

چەنـد نهێنـی و مـوعجيزەی زۆر سـەرنج ڕاکـێش لەسـەر ئەم سـورەتە و قوربانی کردن بزانە!

نهێنی ژمارە (١٠) لە سورەتی (الکوثر).

با بزانين ئايا هيچ نهێنييەک يان مـوعجيزەيەک هەيە لە قورئـانی پيـرۆز دا لەسەر ئەم دە ڕۆژانە دا وە بەتايبەت لەسەر ژمارە (١٠)؟

ئـێمە ئەزانـين خـوای گەورە پاداشـت بە (١٠) قـات زيـاد ئەکـات، وەک خۆی ئەفەرموويێت:

﴿مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ لانعام ١٦٠

لەکۆتايی دە ڕۆژەکان ڕۆژێکی زۆر گرينگ هەيە کە ڕۆژی قوربانە. کاتێ موسڵمانەکان قوربانی ئەکەن بۆ نزيک بوونەوە لە خوا.

وشـەی (انحـر) کە بە واتـای (قوربـانی بـکە) دێـت تەنهـا يەک جـار لە قورئان دا هاتووە، کاتێ خوای گەورە ئەفەرموويێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾

واتە: نوێژ تەنها لەبەر خوا و بۆ خوا و بۆ بەدەست هێنـانی ڕەزامەنـدی پەروەردگارت ئەجام بدەو قوربانیش بکە.

بێگومان شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێش هەیە لەم سورەتە.

ئەگەر بیر لەم سورەتە "الکوثر" بکەینەوە کە باسی قوربانی تیـا کـراوە ئەبینـین سـورەتەکە ڕێـک لە (١٠) وشـە پێـک دێـت. خـوای گەورە ئەیتوانی ئەمـری قوربـانی لە هەر سورەتێکی تـر دا بـاس بکـات، بەڵام سورەتێکی هەڵبژارد کە لە (١٠) وشە پێک دێت وە خودی ئـایەتەکەش کە ئەمری قوربانی کردنی تیادا هاتووە دیسان (١٠) پیـتە وە هەروەهـا قوربانیش ئەکەوێتە ڕۆژی (١٠)یەم. ئەمە بە سودفە نییە!!

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە نیوەی وشـەکانی ئەم سورەتە لە هـیچ سـورەتێکی تـردا نەهـاتوون!، ئەم پێـنج ووشـانە تـایبەتن بە سورەتەکە،وشەکان ئەمانەن:

(اعطینک – الکوثر – انحر – شانئک – الأبتر).

جێگای سەرسوڕمانە کە ئایەتی﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ پێـک دێـت لە (١٠) پیت!، وە هەروەها ئایەتی﴿ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾ پێـک دێـت لە (١٠) پیتی بەپێی ئەلف بێ!!

هەروەها هەموو ئایەتەکان بە پیتی "ر" کۆتایی دێن!!!

وە سـبحان الـلە لە قورئـانی پیـرۆزیش دا (١٠) سـورەت بە پیتـی "ر" کۆتایی هاتوون کە کۆتاییەکەیان سورەتی "الکوثر"ە!

سورەتەکان ئەمانەن: (المائدة – الحج – لقمان – الشوری – القمـر – الممتعنة – القدر – العادیات – العصـر – الکوثر).

ئەمە نهێنییەکی گەورەیە!، شایەنی باسە لە هەموو سورەتەکانی قورئان (بسم الله ...)ئەخوێندرێت جگە لە سورەتی "التوبە" نەبێت کە "بسم الله.." رێک پێک دێت لە (١٠) پیت بە پێی ئەلف و بێ!!!

[ب – س – م – ا – ل – ه – ر – ح – ن- ي]

ئەو پیتەی لە هەموویان زیاتر دووبارە بۆتەوە پیتی (ئەلیف) ە کە (١٠) جار دووبارە بۆتەوە، ژمارەی ئەو پیتانەی کە تەنها یەکجار بەکارهاتوون لەم سورەتە (١٠) پیتن. کۆتایی هەموو ئایەتەکان پیتی (ر)ە کە ئەم پیتەش (١٠)یەمین پیتە لە ئەلف بێی زمانی عەرەبی.

لە قورئان دا (١٤) پیت هەن کە پێیان ئەوترێت پیتە جیاکراوەکان (الحروف المقطعة) ئەو پیتانەن لە هەندێک سورەت دا لە یەکەم ئایەتەوە دێن وەک پیتی (ن) لە سورەتی (ألقلم). ئەم پیتانە رۆڵی زمانەوانی تایبەتیان هەیە کە تا ئێستاش زاناکان بە تەواوی نازانن و بەردەوام ئیلهامی نوێیان بۆ دەر ئەکەوێت بەڵام ئێمە لێرەدا باس لە پەیوەندی ئیعجازی بیرکاری ئەکەین لەسەر ئەم پیتانە کە ئەمانەن:

(أ – ح – ر – س – ص – ع – ق – ک – ل – م – ن – هـ- ي)

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە جگە لەو ١٤ پیتانە ئەو پیتانەی لە سورەتی (الكوثر) بەکار هاتوون (١٠) جار دووبارە بوونەتەوە!

وشەی (سورة)، واتە بەش، بە تاک و کۆی (١٠) جار هاتووە لە قورئان دا!، لە سەرەتای قورئان دا تا کۆتایی ژمارەی ئەو ووشانەی بە پیتی (ر) کۆتایی هاتوون (١٠) وشەن!!

ئەم سـوورەتە بە وشـەی ﴿إِنَّـا﴾ دەسـت پێئەکـات وە یەکەم ئـایەتی قورئـانیش کە بە وشـەی ﴿إِنَّـا﴾ دەسـت پێئەکـات پێـک دێـت لە (١٠) وشە!!

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَا تُسْأَلُ عَنْ أَصْحَابِ الْجَحِيمِ﴾. بەقەرە ١١٩

ئەگەر ژمـارەی ئایەتەکـانی سـوورەتی (الکـوثر) کـۆبکەینەوە (١+ ٢+ ٣=٦) ژمارە شـەش مـان دەسـت ئەکەوێـت، بـا بـزانین گرینگـی ژمـارە شەش چییە لەم سوورەتە دا.

لە تەواوی ئەلف و بێی عەرەبی تەنها (٦) پیـت دووبـارە بـوونەتەو لەم سوورەتە دا: (أ – ر – ک – ل – ت – و)

کاتێک سەیری ڕێکخستنی ئەم پیتانە ئەکەین بە پێی ئەلف و بێ، ئەوا بەم شێوەیە:

| پیـــــت/ | أ | ر | ک | ل | ت | و |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕێکخستن/ | ١ | ١٠ | ٢٢ | ٢٣ | ٢٥ | ٢٧ |

سەرجەمی ئەو ژمارانە ئەکاتە (١٠٨) کە ئەمەش ژمـارەی سـوورەتەکەیە لە قورئان دا!! پیتی (ر) کۆتایی بە هەموو ئایەتەکانی هێنـاوە، ئێسـتا گەر سـەیری ڕێکخسـتنی پیـتەکە بکەیـن لە تەواوی سـوورەتەکە دا، ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت:

یەکەم پیتی (ر) ١٦ەمین پیتە لە سوورەتەکە دا، دووەم پیتـی (ر) ٢١ ەمین پیتە، سێیەم پیتـی (ر) ٢٨ەمـین پیـتە وە چوارەمیـان ٤٣ەمـین پیـتە، سـەرجەمی ئەو ژمـارانەش دیسـان ئەکـاتە (١٠٨) کە ژمـارەی سوورەتەکەیە!!

زیـاتر لەوەش، لە ئـایەتی یەکەم پیتەکـانی وشـەی یەکەم (١٥) جـار دووبـــارە بـــوونەتەوە وە پیتەکـــانی وشـــەی دووەم (٢٢) جـــار دووبـارەبوونەتەوە. پیتەکـانی وشـەی سـێیەم (٢٦) جـار. سـەرجەمی هەموو ئەو ژمارانە ئەکاتە (٦٣). (الكوثر)یش ناوی یەکێکە ڕووبارەکانی بەهەشـت کە دراوەتە پێغەمبەرمـان (سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) کە تەمەنی (٦٣) ساڵە.

ئەگەر دیسان هەمان شت دووبارە بکەینەوە لەگەڵ ئـایەتی دووەم، واتە بزانین پیتەکان چەند جار دووبـارە بـوونەتەوە لە هەر وشـەیەک دا ئەوا ژمـــارە (٤٣) دەر ئەچێـــت (٦) جـــار پیتەکـــانی وشـــەی یەکەم دوبارەبوونەتەوە وشەی دووەم (١٤) جار وە وشەی سێیەم (٢٣) جـار. سـەرجەمیان ئەکـاتە (٤٣) کە ئەمەش ژمـارەی تەواوی پیتەکـانی ئەم سوڕەتەیە!!

ئەگەر هەمان شت ئەنجام بـدەین لەگەڵ سـێیەمین ئـایەتیش – ئـایەتی کۆتایی ئەوە سەرەنجام ژمارە (٦١) دەر ئەچێت.

(٦١) ژمارەیەکی بنەڕەتییە – تەنها بەسەر خۆیـدا دابەش ئەبێـت. ئەم ژمارە جاران (×) ی هیچ ژمارەیەک نییە.

کە ئەمەش مەبەستەکەیە لەم ئایەتە دا خراوەتە ڕوو؛ کۆتـا وشـەی ئەم سـوڕەتە (الابتـر)ە. باسـی ئەوانە ئەکـات کە بە پێغەمـبەر (سـەلامی خوای لەسەر بێت)پێئەکەنن بە گاڵتە. خوای گەورە ئەفەرمووێـت ئەوانە (الابتر)ن واتە بـێ بەشـن لە نەوە و بەرە، نـازو نـیعمەت، هـیچ شـتێک

نایانگرێتەوە . لە کۆتایی دا هیچ شتێکی باش بۆیان نامینێتەوە لە دوا ڕۆژدا .

ئەمری قوربانی کردن: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾.

ئـایەتەکە بە پیتـی (ف) دەسـت پێئەکـات کە دەلالەت لەوەی کە لە پێش و پاشی دێت ئەکات، هەردوو ئایەتەکان بەیەکەوە ئەبەستێتەوە .

کاتێک خـوای گەورە نیعمەتێکی زۆر گەورەی بە پێغەمبەرﷺ بەخشـی، ئەم نـیعمەتە بە هـیچ کەسـی تـر نەبەخشـراوە کە کەوسـەرە (کەوسـەر واتە چـاکەی نەبـڕاوە، لە هەموویـان گرینگتـر قورئـان وە کەوسـەر ڕوبارێکیشـە لە بەهەشـت) کە لە ئـایەتی یەکەم دا بـاس کـراوە کەواتە پێویست ئەکات وەڵامی خواش بدرێتەوە لە بەرامبەر ئەو چاکە گەورەیە دا بۆیە ئـایەتەکەی دوای خـۆی ڕێـک ئەمـری نـوێژ بە چـاکی کـراوە وە ئەمە بیرخستنەوەیەکیشە بۆ سـوڕەتەکەی پـێش (الکـوثر) کاتێـک خـوا باس لەوانە ئەکات کە نوێژ بە تەمبەڵی ئەکەن و پاشـان ئەوانەی تەنهـا بۆ دەرخستن نوێژ ئەکەن. ﴿الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ الماعون ٥

ئەو نوێژگەرانەی گوێ نادەن بە نوێژەکانیان و کارکردی نیـە لەسـەریان و دڵی نادەنێ و لێی غافڵن. ﴿الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ﴾ الماعون ٦

ئەوانەی کە ڕیا بازن و بە ڕووکـەش نـوێژ دەکـەن و دەیانـەوێت خۆیـان دەربخەن و (ئیمانداران بخەڵەتێنن).

بەڵام لەم سوڕەتە دا ئاماژە بەوە کراوە کە نوێژ بۆ خوا بکرێت

﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ کەواتە لێرە تێئەگەین کە باشترین وەڵامدانەوە بەرامبەر نیعمەتی خوا نوێژکردنە وەک شوکرانە کردن چونکە خوا نەیفەرموو (واشکر لربک) بۆیە پێغەمبەرﷺ دوو ڕکات نوێژی ئەکرد هەرکاتێک شتێکی باشی بۆ هاتبایە.

لە قورئان دا سێ وشە بەکار هاتوون بۆ قوربانی. یەکەمیان وشەی (ذبح):

﴿وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ بەقەرە ٤٩

واتە: بیری نیعمەتی ڕزگاربونیشتان بکەنەوە کاتێک ڕزگارمان کردن و لەدەست دارو دەستەی فیرعەون کە خراپترین سزاو ئازاریان دەدان، کوڕەکانتانیان سەردەبڕین و ئافرەتەکانتانیان دەهێشتنەوە (بۆ کارەکەری و خزمەت) ئەوەش بۆ ئێوە توشهات و تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بۆتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە (تا پشت بەو زاتە ببەستن و بڕوای تەواوتان پێی هەبێت)، ئەم جۆرە سەر بڕینە لۆ هۆکارە دینییەکان و ئەجێندای بەرزتر بەکاردێت.

وشەی دووەم (ذکی): ﴿وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ مائدة ٣

ئەم وشە بەکاردێت بۆ گیانەوەرێک بەخێرایی بکوژرێت.

ئینجا وشەی (نحر) مان هەیە.

بۆچی خوای گەورە ئەو وشەیەی هەڵبژارد و تایبەتی کرد؟ لەبەرئەوەی (نحر) واتە ئەوەی لە سەرووی سینگە — بڕین لە گەردنەوە. ئەمەش

ڕاستەوخۆ ئیبراهیم پێغەمبەرمان بیردێنێتەوە چونکە ئەصڵی قوربانی کردن لەوکاتەوە سەرچاوەی گرت.

بزانە ...

لێکۆڵەرەوەی گەنجی خەلیجی ( لوئەی شەریف ) توێژینەوەیەک زانستی پێشکەشکرد سەبارەت بە مانای پیتە دابراوەکان لە قورئانی پیرۆز کە لە سەرەتاکانی هەندێ لە سورەتەکانی قورئاندا هاتوون وەکوو ( الر ، الم، هتد ...) و ئەو لێکۆڵینەوەی شەریف بە شتێکی زۆر ناوازە لە دادەنرێت و شیکردنەوەکانی زۆر بە شیکردنەوەیەکی لۆژیکی دادەنرێت بۆ مانا و مەبەستی ئەو پیتە دابراوانە کە لە ماوەی (١٤٠٠) ساڵ موسلمانان دەیڵێنەوە لە کتێبە پیرۆزەکەیان و بە دیاریکراوی نازانن مانای چیە. لەگەڵ ئەوەی ئەو پیتانە چەندان مانای هەلگرتوە و شیکردنەوەی زۆر جیاوازی بۆ کراوە لە نێوان موسوڵماناندا، هەندێک وتویانە کە لە دەستپێکی هەندێک ئایەتی قورئان هاتووە بۆ ئەوەی زیاتر هۆشی خوێنەرەکە یاخود ئەو کەسەی کە گوێ لە قورئانەکە دەبێت رابکێشێ، جگە لە چەندین شیکردنەوەی تر... کە زۆر تا کەم موسوڵمانان پێیان ئاشنان.

شەریف لە کاتێکدا کە گرنگی بە زمانی ( السامیة ) دەدات ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە بنچینەی ئەلف و بێی زمانی عەرەبی لە ئەلف و بێی زمانی سریانی وەرگیراوە..

شەریف دەڵێت من لێکۆڵینەوەم دەربارەی ئەو زانیاریە کرد و دڵنیا بوومەوە لە ڕاستی ئەو وتەیە و لە چەند سەرچاوەیەک "

شەریفی لێکۆڵەرەوە ئاماژەی بەوە کردووە کە پیتەکانی وەک ( ألم ، ألر ، طه ، کهیعص هتد..) هیچ مانایەکیان نییە لە زمانی عەرەبی بەڵام لە زمانی سریانی کە ئەسڵی ئەلف و بێی عەرەبیە مانایان هەیە.

لێکۆڵینەوەکانی ئەوەی دەرخست کە هەر پیتێک لەوانە ماناکەی لە خودی خۆی دایە، لەسەر ئەم بنەمایە هەندێک لێکۆڵینەوەم لە ماناکانی ئەم پیتانە کرد لە زمانی سریانی و ئەم ڕاستیانەی بۆم دەرکەوتن و ئەنجامەکان زۆر جێگەی سەرسوڕمان بوو و جێگەی باوەڕکردن نەبوون، ئەنجامەکان لە ڕێگەی وەرگێڕانی مۆرفێکس بوو لە بەرامبەر هەموویان بوو واتا وەرگێڕانی تایبەتی خۆم نەبووە.

لە ناوەڕۆکەکەیدا ووتی کە ( ألم ) واتا (بێ دەنگ بە) کە ئەم دەستەواژەیە پێغەمبەر داوود (د.خ) لە ووتەکانی کاتێک دەیویست شتێکی گرنگ بڵێ بەکاری دەهێنا. ئەمەش لە تەورات و زبور باسکراوە تا ئەوڕۆمان و بە هەمان پیت واتا هەر بە ( ألم ). بەڵام بە شێوازی عیبری وسریانی کاتێک ئەو مانایە جێ بەجێ دەکەین بەسەر قورئانی پیرۆز بۆ نموونە لە سوڕەتی (ألبقرة) .

﴿ألم،ذلك الكتاب لا ريب فيه ﴾ بەواتای ("بێ دەنگبە" ئەو پەرتووکە هیچ هەڵە و گومانێکی تێدا نییە). لێرە سەیری ماناکەی بکەن کە چۆن بەیەکەوە گونجاون و لێک وەشاونەتەوە.

ألر: بەواتای (سەیر بکە) بە سەرنجەوە سەیر بکە و کاتێک چاوێک بەم ئایەتانە دادەخشێنین کە ( ألر )ی تێدایە لە قورئانی پیرۆز دەبینین کە پێکدێت لە شتێک کە سەیرکردن یاخود تێڕامانی تێدایە.

ئەو سورەتانەی کەبە ( ألر ) دەست پێدەکات: سورة یونس:

﴿ألر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْحَكِيمِ﴾ ("سەیر بکە" ئەمە ئایەتەکانی قورئانی نەگۆڕاوی پڕ حیکمەتە)

﴿ألر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾

( "سەیر بکە" ئەمە کتێبێکە پتەو داڕێژراوە ئایەتەکانی پاشان ڕوون کراونەتەوە لەلایەن (خوای) کاردروستی زاناوە).

سورەتی یوسف: ﴿ألر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ ("سەیر بکە"ئەمانە نیشانەکانی کتێبی ئاشکران)

سورتی ابراهیم: ﴿ألر كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ ("سەیر بکە" ئەمە پەڕاوێکە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ بۆ ئەوەی خەڵکی ڕزگار بکەیت لەتاریکی یەکانەوە بۆ ڕووناکی بە ئیزنی پەروەردگاریان (ڕێنموونیان بکەیت) بۆ ڕێگای (خوای) بەدەسەڵات و زاڵی سوپاس کراو).

سورة الحجر: ﴿ألر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَقُرْآنٍ مُّبِينٍ﴾

("سەیر بکە" ئەمە ئایەتەکانی ئەو کتێبەن کە قورئانی ڕوون کەرەوەیە).

سەرنج بدەنە وشەی (طه) کە بەپێی لێ کۆڵینەوەکان بێت لە زمانی سریانیدا بە واتای (ئەی پیاو دێت) کاتێک لە سورەتی تاها بەکار هاتوە ماناکەی بەم جۆرەی لێ دێت. (ئەی پیاو (محمد) ئێمە ئەم

قورئانەمان بۆ ئەوە دانەبەزاندۆتە سەر تۆ کە ببێت بە بارگرانی و ناڕەحەتی بۆت). ﴿"یارجل" مَاأَنزَلْنَاعَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ﴾

(ئەگەر سەیری ماناکەی بکەین دەبینین زۆر لەگەڵ یەک دەگونجێن )

کهیعص: بە مانای (باسی بکە یان بە خەلکی بڵێ)

﴿ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا﴾. ("خەلکی بڵێ " ئەمەی (دەخوێنرێتەوە بەسەرتدا) باسی بەزەیی پەروەردگارتە بە بەندەی خۆی کە زەکەریایە).*

بزانە...

لە قورئاندا تەنها لە (٣) ئایەت الله ﷻ بە ڕاستەوخۆیی باسی لە وەفاتی پێغەمبەرﷺ کردوە بە وشەی ﴿ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ تەنها دەمەوێ سەیری ئەو (٣) ئایەتە بکەن و لە چ سوڕەتێکن.

لەو(٣) ئایەتەی کە وشەی﴿نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ تێدایە کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ مەبەست لە پێغەمبەرەﷺ.

لە سوڕەتی غافر:﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ ٧٧

جا ئەی پێغەمبەرﷺ ئارامگربە و دڵنیاش بە کە بەڵێنی خوا ڕاست و دروستە و هەر دێتەدی، ئەوسا یان ئەوەیە کە هەندێ لە هەڕەشەکانمان دژیان بەچاوی خۆت دەبینیت، یاخود ئەگەر گیانمان کێشایت و وەفاتت

* لە پەیجی دکتۆر عبدالواحدەوە وەرگیراوە.

کرد ئەوانە بۆ کوێ دەچن؟!، بەناچاری هەر بۆ لای ئێمە دەبرێنەوە (ئەوسا بەتوندی تۆڵەیان لێ دەسێنین).

وە لە سورەتی الرعدا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾ ٤٠

(جا ئەگەر هەندێ لە هەڕەشەکانی خۆمانیان بۆ پێش بهێنین و نیشانت بدەین، یاخود بتمرێنین و سەرئەنجامی ئەوان نەبینیت، خەفەت مەخۆ چونکە بەڕاستی تۆ تەنها گەیاندنی پەیامەکەت لەسەرە، لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە).

وە لە سورەتی یونسدا دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ اللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ﴾ ٤٦

(خۆ ئەگەر هەندێک لە هەڕەشەکانی خۆمان (بۆ خوا نەناسان) پێش بهێنین و نیشانی تۆی بدەین، یاخود پێشتر گیانت بکێشین و ئاکامیان نەبینیت، ئەوە گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمەیە (لەدەستمان دەرباز نابن)، لەوەو دواش خوا خۆی شایەتە لەسەر هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن).

ئێستا با تەنها ژمارەی ئەو سوڕەتانەی کە ئەو ئایەتانەی تێدایە و وشەی﴿نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ی تێدایە کۆکەینەوە.

سوڕەتی (غافر) کە سوڕەتی ژمارە (٤٠) و سوڕەتی (الرعد) سوڕەتی ژمارە (١٣) و سوڕەتی (یونس) سوڕەتی ژمارە (١٠) یە بەپێی ڕیزبەندی سوڕەتەکان لە قورئان (موسحەف)

٤٠+١٣+ ١٠=٦٣

وە ئەگەر زانیاریتان هەبێ تەمەنی پێغەمبەر ﷺ (٦٣) ساڵ بوو.

کە ئەوەش لە (٣) شوێن ئاماژە بە وەفاتی دراوە و ئەو (٣) ئایەتەش لە سورەتانێکن کە کۆیان بکەیەوە تەمەنی پێغەمبەر ﷺ دەردەچێ.

ئێستا با زیاتر لەو ژمارانە وردببینەوە، هەموومان دەزانین کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆهات تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو.

کە (٤٠) ژمارەی سورەتی (غافر)ە کە ئاماژە بە وەفاتی پێغەمبەر کراوە. وە قۆناغی پاش وەحی کە لە شاری مەککە بوو (١٣) ساڵ لە مەککە بوە یان (١٣) ساڵ لە مەککە ژیاوە.

کە ژمارە (١٣)ش ژمارەی سورەتی (الرعد)ە کە ئاماژە بە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ کراوە.

وە قۆناغێکی تری ژیانی پێغەمبەر ﷺ کە لە مەدینە بوە و لە مەدینە ژیاوە (١٠) ساڵ بوە

کە (١٠)ش هەمان ژمارەی سورەتی (یونس)ـە کە سورەتی ژمارە (١٠)یە

بزانە...

وردی لەفزەکانی قورئان سەرەتا بەم ئایەتە دەسپێدەکەین کە بەئایەتی تەحەدا ناسراوە: ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا﴾ الإسراء:٨٨

بائێستە بێین ئەم ئایەتە لە تەرازووی وشەی (اللە رب العالمین)بدەین واتا:ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتەکانی (اللە رب العالمین) لەم ئایەتەدا: ا-١٤،ل-١١،ل-١١،هـ-٤،ر-٢،ب-٤،ا-١٤،ل-١١،ع-٤،ا-١٤،ل-١١،م-٤،ی-٣،ن-٧

کۆی هەموو پیتەکانی (اللە رب العالمین =١١٤)ئەوەش عەددی سورەتەکانی قورئانە.

ئێستا بابیدەین لە حرووفی هیجائی واتا ریزبەندی حرووف ئەبجەدی پیتەکانی عەرەبی بەم شێوەیە: ا-١،ل-٢٣،ل-٢٣،هـ-٢٦،ر-١٠،ب-٢،ا-١،ل-٢٣،ع-١٨،ا-١،ل-٢٣،م-٢٤،ی-٢٨،ن-٢٥

کۆی هەموو هەموویان =٢٢٨ ئەمەش یەکسانە بە= ١١٤+ ١١٤ با بەردەوام بین ...

ئەم ئایەتەی سەرەوە کە باسمان کرد ئایەتی ژمارە (٨٨)ی سورەتی ئیسراء بوو ئێستا بابچینە سەر سورەتی (ص) کە (٨٨) ئایەتە دەچینە ئایەتی (٢٢).

﴿إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ﴾

دووبارە دەیدەین لە تەرازووی دووبارەبوونەوەی پیتەکانی (اللە رب العالمین).

ا-١٨،ل-٩،ل-٩،هـ-٢،ر-١،ب-٥،ا-١٨،ل-٩،ع-٥،ا-١٨،ل-٩،م-٤،ی-١،ن-٦

بەهەمان شێوە کۆی هەموویان =١١٤ ئەکات پیتی (صاد)یش لەحرووفی ئەبجەدی ژمارە ١٤یە .

زۆر باسەکە درێژ ناکەینەوە ئەمەش ئەو ئایەتانەن تاکو ئیستە دۆزراونەتەوە بەم شێوەیە:

ئایەتی ٤٧ی سورەتی قصص .

ئایەتی ٢٢ی سورەتی الزمر.

ئایەتی ٤٧ی سورەتی غافر.

ئایەتی ١٤ ی سورەتی الكهف.

ئایەتی ١٤ی سورەتی هود.

ئێستە دەچینە سورەتی الفاتیحة: لەقاڵبی (اللە رب العالمین) دەدەین بەبێ ئەلف (ا) واتا (لله رب العالمین):

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(١) ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٢) ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ (٣) مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ (٥) ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ (٦) صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ (٧).

ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتەکان: ل-٢٢،ل-٢٢،هـ-٥،ر-٨،ب-٤،ا-٢٦،ل-٢٢،ع-٦،ا-٢٦،ل-٢٢،م-١٥،ی-١٤،ن-١١

کۆی هەموویان یەکسانە =٢٠٣

وەئەمیش یەکسانە بە ٧ × ٢٩

٧ = عددی ئایاتی سورەتی فاتیحە.

٢٩ = عددی وشەكانی سوڕەتی فاتیحە.

ئێستە دێین بە ئەلفەوە (ا) دەیدەینە لە تەرازووی (الله رب العالمین):

ا-٢٦،ل-٢٢،ل-٢٢،هـــ-٥،ر-٨،ب-٤،ا-٢٦،ل-٢٢،ع-٦،ا-٢٦،ل-٢٢،م-١٥،ی-١٤،ن-١١

كۆی هەموویان = ٢٢٩ ئەم ژمارەیە چیە؟ ئێستە دەردەكەوێ چییە!

لەحەوت شوێنی جیاوازدا (الله رب العالمین) هاتووە بەم شێوەیە:

١-﴿لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ المائدة:٢٨

٢-﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ الأعراف:٥٤

٣-﴿فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾النمل:٨

٤-﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ القصص:٣٠

٥ -﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ غافر:٦٤

٦ -﴿مَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ الحشر:١٦

٧ –﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ التكوير:٢٩

ئێستا با هەموو ژمارەی ئەم (٧) ئایەتە کۆبکەینەوە بزانین چەند دەکات: کۆی هەموویان ئەکاتە = ٢٢٩

واتا (٢٢٩) کۆی ژمارەی هەموو ئایەتەکانە.

(٢٢٩) کۆی هەموو پیتەکانی الله رب العالمین یشە.

# ( خشتەکان )

خشتەیەکی ئاسان بۆ زانینی ماوەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

| پێوانەی لەبەرکردنی ڕۆژانە | ماوەی لەبەرکردنی هەموو قورئانی پیرۆز | | | پێوانەی لەبەرکردنی ڕۆژانە | ماوەی لەبەرکردنی هەموو قورئانی پیرۆز | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ساڵ | مانگ | ڕۆژ | | ساڵ | مانگ | ڕۆژ |
| یەک ئایەت | ١٢ | ٧ | ٩ | دوانزە ئایەت | ١ | ٥ | ١٥ |
| دوو ئایەت | ٨ | ٩ | ١٨ | سیانزە ئایەت | ١ | ٤ | ٦ |
| سێ ئایەت | ٥ | ١٠ | ١٣ | چواردە ئایەت | ١ | ٣ | - |
| چوار ئایەت | ٤ | ٤ | ٢٤ | پانزە ئایەت | ١ | ٣ | ١ |
| پێنج ئایەت | ٣ | ٦ | ٧ | شانزە ئایەت | ١ | ١ | ٦ |
| شەش ئایەت | ٢ | ١١ | ٤ | حەڤدە ئایەت | ١ | - | ١٠ |
| حەوت ئایەت | ٢ | ٦ | ٣ | هەژدە ئایەت | - | ١١ | ١٩ |
| هەشت ئایەت | ٢ | ٢ | ١٢ | نۆزدە ئایەت | - | ١١ | ١ |
| نۆ ئایەت | ١ | ١١ | ١٢ | نیو لاپەڕە | ٣ | ٤ | ٢٤ |
| دە ئایەت | ١ | ٩ | ٣ | لاپەڕەیەک | ١ | ٨ | ١٢ |
| یانزە ئایەت | ١ | ٧ | ٦ | یەک پەڕە | - | ١٠ | ٦ |

بزانە ...

وەک ڕوونە ئەو قورئــانەی ڕۆژانە تــۆ ئەی خــوێنیتەوە ســورەتەکانی ڕیزبەنــدی نەکــراون بەپێــی کــاتی دابەزانــدنیان. بــۆ نمونە:هەموومــان دەزانــین یەکەم ســورەت کە دابەزی بــۆ پێغەمــبەری خــودا ﷺ ســورەتی (العلق)بـــــوو، بەڵام ئەم ســــــورەتە لە قورئانـــــدا ســــــورەتی ژمارە (نەوەتوشەشـ)ــە، وە ســورەتی (الفــاتحە) کە یەکەم ســورەتە لە

قورئـانی پیـرۆز بەڵام بەپێـی کـاتی دابەزاندنی (پێنج)ـەم سـورەتی قورئانە.

ئەمەی خـوارەوە خشـتەیەکە ڕیزبەنـدی سـورەتەکانی قورئـانە بە تەسەسول بەپێی کاتی دابەزینیان، واتا یەکەم سورەتی قورئـانی پیـرۆز دابەزی چی بوو؟ ئەی دووەم، سێیەم... هەتا ١١٤.

## خشتەی دووەم

ڕیزبەندی سورەتەکانی قورئان بە تەسەسول بەپێی کاتی دابەزینیان.

| ژمارە | ناوی سورەت | ڕیزبەندی بەپێی موسحف | ژمارەی ئایات | مەکەیی یان مەدینەیی | ژمارە | ناوی سورەت | ڕیزبەندی بەپێی موسحف | ژمارەی ئایات | مەکەیی یان مەدینەیی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | العلق | ٩٦ | ١٩ | مكيه | ٥٨ | سبا | ٣٤ | ٥٤ | مكيه |
| ٢ | القلم | ٦٨ | ٥٢ | مكيه | ٥٩ | الزمر | ٣٩ | ٧٥ | مكيه |
| ٣ | المزمل | ٧٣ | ٢٠ | مكيه | ٦٠ | غافر | ٤٠ | ٨٥ | مكيه |
| ٤ | المدثر | ٧٤ | ٥٦ | مكيه | ٦١ | فصلت | ٤١ | ٥٤ | مكيه |
| ٥ | الفاتحه | ١ | ٧ | مكيه | ٦٢ | الشورى | ٤٢ | ٥٣ | مكيه |
| ٦ | المسد | ١١١ | ٥ | مكيه | ٦٣ | الزخرف | ٤٣ | ٨٩ | مكيه |
| ٧ | التكوير | ٨١ | ٢٩ | مكيه | ٦٤ | الدخان | ٤٤ | ٥٩ | مكيه |
| ٨ | الأعلى | ٨٧ | ٩١ | مكيه | ٦٥ | الجاثيه | ٤٥ | ٣٧ | مكيه |
| ٩ | الليل | ٩٢ | ٢١ | مكيه | ٦٦ | الأحقاف | ٤٦ | ٣٥ | مكيه |
| ١٠ | الفجر | ٨٩ | ٣٠ | مكيه | ٦٧ | الذاريات | ٥١ | ٦٠ | مكيه |
| ١١ | الضحى | ٩٣ | ١١ | مكيه | ٦٨ | الغاشيه | ٨٨ | ٦٢ | مكيه |
| ١٢ | الشرح | ٩٤ | ٨ | مكيه | ٦٩ | الكهف | ١٨ | ١١٠ | مكيه |
| ١٣ | العصر | ١٠٣ | ٣ | مكيه | ٧٠ | النحل | ١٦ | ١٢٨ | مكيه |
| ١٤ | العاديات | ١٠٠ | ١١ | مكيه | ٧١ | نوح | ٧١ | ٢٨ | مكيه |
| ١٥ | الكوثر | ١٠٨ | ٣ | مكيه | ٧٢ | ابراهيم | ١٤ | ٥٢ | مكيه |
| ١٦ | التكاثر | ١٠٢ | ٨ | مكيه | ٧٣ | الأنبياء | ٢١ | ١١٢ | مكيه |

| ١٧ | الماعون | ١٠٧ | ٧ | مكيه | ٧٤ | المؤمنون | ٢٣ | ١١٨ | مكيه |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٨ | الكافيرون | ١٠٩ | ٦ | مكيه | ٧٥ | السجده | ٣٢ | ٣٠ | مكيه |
| ١٩ | الفيل | ١٠٥ | ٥ | مكيه | ٧٦ | الطور | ٥٢ | ٤٩ | مكيه |
| ٢٠ | الفلق | ١١٣ | ٥ | مكيه | ٧٧ | الملك | ٦٧ | ٣٠ | مكيه |
| ٢١ | الناس | ١١٤ | ٦ | مكيه | ٧٨ | الحاقه | ٦٩ | ٥٢ | مكيه |
| ٢٢ | الأخلاص | ١١٢ | ٤ | مكيه | ٧٩ | المعارج | ٧٠ | ٤٤ | مكيه |
| ٢٣ | النجم | ٥٣ | ٦٢ | مكيه | ٨٠ | النبا | ٧٨ | ٤٠ | مكيه |
| ٢٤ | عبس | ٨٠ | ٤٢ | مكيه | ٨١ | النازعات | ٧٩ | ٤٦ | مكيه |
| ٢٥ | القدر | ٩٧ | ٥ | مكيه | ٨٢ | الانفطار | ٨٢ | ١٩ | مكيه |
| ٢٦ | الشمس | ٩١ | ١٥ | مكيه | ٨٣ | الانشقاق | ٨٤ | ٢٥ | مكيه |
| ٢٧ | البروج | ٨٥ | ٢٢ | مكيه | ٨٤ | الروم | ٣٠ | ٦٠ | مكيه |
| ٢٨ | التين | ٩٥ | ٨ | مكيه | ٨٥ | العنكبوت | ٢٩ | ٦٩ | مكيه |
| ٢٩ | قريش | ١٠٦ | ٤ | مكيه | ٨٦ | المطففين | ٨٣ | ٣٦ | مكيه |
| ٣٠ | القارعه | ١٠١ | ١١ | مكيه | ٨٧ | البقره | ٢ | ٢٨٦ | مدينه |
| ٣١ | القيامه | ٧٥ | ٤٠ | مكيه | ٨٨ | الأنفال | ٨ | ٧٥ | مدينه |
| ٣٢ | الهمزه | ١٠٤ | ٩ | مكيه | ٨٩ | ال عمران | ٣ | ٢٠٠ | مدينه |
| ٣٣ | المرسلات | ٧٧ | ٥٠ | مكيه | ٩٠ | الاحزاب | ٣٣ | ٧٣ | مدينه |
| ٣٤ | ق | ٥٠ | ٤٥ | مكيه | ٩١ | الممتحنه | ٦٠ | ١٣ | مدينه |
| ٣٥ | البلد | ٩٠ | ٢٠ | مكيه | ٩٢ | النساء | ٤ | ١٧٦ | مدينه |
| ٣٦ | الطارق | ٨٦ | ١٧ | مكيه | ٩٣ | الزلزله | ٩٩ | ٨ | مدينه |
| ٣٧ | القمر | ٥٤ | ٥٥ | مكيه | ٩٤ | الحديد | ٥٧ | ٢٩ | مدينه |
| ٣٨ | ص | ٣٨ | ٨٨ | مكيه | ٩٥ | محمد | ٤٧ | ٣٨ | مدينه |
| ٣٩ | الأعراف | ٧ | ٢٠٦ | مكيه | ٩٦ | الرعد | ١٣ | ٤٣ | مدينه |
| ٤٠ | الجن | ٢٨ | ٧٢ | مكيه | ٩٧ | الرحمن | ٥٥ | ٧٨ | مدينه |
| ٤١ | يس | ٣٦ | ٨٣ | مكيه | ٩٨ | الانسان | ٧٦ | ٣١ | مدينه |
| ٤٢ | الفرقان | ٢٥ | ٧٧ | مكيه | ٩٩ | الطلاق | ٦٥ | ١٢ | مدينه |
| ٤٣ | فاطر | ٣٥ | ٤٥ | مكيه | ١٠٠ | البينه | ٩٨ | ٨ | مدينه |
| ٤٤ | مريم | ١٩ | ٩٨ | مكيه | ١٠١ | الحشر | ٥٩ | ٢٤ | مدينه |
| ٤٥ | طه | ٢٠ | ١٣٥ | مكيه | ١٠٢ | النور | ٢٤ | ٦٤ | مدينه |
| ٤٦ | الواقعة | ٥٦ | ٩٦ | مكيه | ١٠٣ | الحج | ٢٢ | ٧٨ | مدينه |
| ٤٧ | الشعراء | ٢٦ | ٢٢٧ | مكيه | ١٠٤ | المنافقون | ٦٣ | ١١ | مدينه |

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٤٨ | النمل | ٢٧ | ٩٣ | مكيه | ١٠٥ | المجادله | ٥٨ | ٢٢ | مدينه |
| ٤٩ | القصص | ٢٨ | ٨٨ | مكيه | ١٠٦ | الحجرات | ٤٩ | ١٨ | مدينه |
| ٥٠ | الأسراء | ١٧ | ١١١ | مكيه | ١٠٧ | التحريم | ٦٦ | ١٢ | مدينه |
| ٥١ | يونس | ١٠ | ١٠٩ | مكيه | ١٠٨ | التغابن | ٦٤ | ١٨ | مدينه |
| ٥٢ | هود | ١١ | ١٢٨ | مكيه | ١٠٩ | الصف | ٦١ | ١٤ | مدينه |
| ٥٣ | يوسف | ١٢ | ١١١ | مكيه | ١١٠ | الجمعه | ٦٢ | ١١ | مدينه |
| ٥٤ | الحجر | ١٥ | ٩٩ | مكيه | ١١١ | الفتح | ٤٨ | ٢٩ | مدينه |
| ٥٥ | الأنعام | ٦ | ١٥٦ | مكيه | ١١٢ | المائده | ٥ | ١٢٠ | مدينه |
| ٥٦ | الصافات | ٣٧ | ١٨٢ | مكيه | ١١٣ | التوبه | ٩ | ١٢٩ | مدينه |
| ٥٧ | لقملن | ٣٢ | ٣٤ | مكيه | ١١٤ | النصر | ١١٠ | ٣ | مدينه |

## خشتەی سێیەم

### ژماردنی ژمارەی (سورەت و ئایەت و وشە و پیت).

| ژمارەی سورەت | ناوی سورەت | ژمارەی ئایات | ژمارەی وشە | ژمارەی پیت |
|---|---|---|---|---|
| ١ | الفاتحا | ٧ | ٣١ | ١٣٩ |
| ٢ | البقره | ٢٨٦ | ٦٩٤٨ | ٢٥٦١٣ |
| ٣ | ال عمران | ٢٠٠ | ٣٩٤٨ | ١٤٦٠٥ |
| ٤ | النساء | ١٧٦ | ٤٢٥٤ | ١٥٩٣٧ |
| ٥ | المائده | ١٢٠ | ٣١٦٠ | ١١٨٩٢ |
| ٦ | الانعام | ١٦٥ | ٣٤٣٧ | ١٢٤١٨ |
| ٧ | الاعراف | ٢٠٦ | ٣٦٩٧ | ١٤٠٧١ |
| ٨ | الانفال | ٧٥ | ١٤٢٠ | ٥٢٩٩ |
| ٩ | التوبه | ١٢٩ | ٢٨٥١ | ١٠٨٧٣ |
| ١٠ | يونس | ١٠٩ | ٢٠١٧ | ٧٤٢٥ |
| ١١ | هود | ١٢٣ | ٢١٣٥ | ٧٦٣٣ |
| ١٢ | يوسف | ١١١ | ١٩٥٨ | ٧١٢٥ |
| ١٣ | رعد | ٤٣ | ٩٧٣ | ٣٤٥٠ |
| ١٤ | ابراهم | ٥٢ | ٩٣٤ | ٣٤٦١ |
| ١٥ | الحجر | ٩٩ | ٧٢٧ | ٢٧٩٧ |
| ١٦ | النحل | ١٢٨ | ٢٠٨٠ | ٧٦٤٢ |

| ١٧ | الاسراء | ١١١ | ١٧٤٣ | ٦٤٨٠ |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | الكهف | ١١٠ | ١٧٤٠ | ٦٤٢٥ |
| ١٩ | مريم | ٩٨ | ١٠٨٤ | ٣٨٣٥ |
| ٢٠ | طه | ١٣٥ | ١٤٨١ | ٥٢٨٨ |
| ٢١ | الانبياء | ١١٢ | ١٣٢٢ | ٤٩٢٥ |
| ٢٢ | الحج | ٧٨ | ١٤٣٧ | ٥١٩٦ |
| ٢٣ | المؤمن | ١١٨ | ١١٦٣ | ٤٣٥٤ |
| ٢٤ | النور | ٦٤ | ١٤٨١ | ٥٥٩٦ |
| ٢٥ | الفرقان | ٧٧ | ١٠٢٧ | ٣٧٨٦ |
| ٢٦ | الشعراء | ٢٢٧ | ١٤٦٠ | ٥٥١٧ |
| ٢٧ | النمل | ٩٣ | ١٢٧٢ | ٤٦٧٩ |
| ٢٨ | القصص | ٨٨ | ١٥٧٦ | ٥٧٩١ |
| ٢٩ | العنكبووت | ٦٩ | ١١١٤ | ٤٢٠٠ |
| ٣٠ | الروم | ٦٠ | ٩١٣ | ٣٣٨٨ |
| ٣١ | لقمان | ٣٤ | ٦٠٨ | ٢١٢١ |
| ٣٢ | السجده | ٣٠ | ٤٠٥ | ١٥٢٣ |
| ٣٣ | الاحزاب | ٧٣ | ١٥٠١ | ٥٦١٨ |
| ٣٤ | سبا | ٥٤ | ٩٩٣ | ٣٥١٠ |
| ٣٥ | فاطر | ٤٥ | ٨٦٨ | ٣١٥٩ |
| ٣٦ | يس | ٨٣ | ٨٠٤ | ٢٩٨٨ |
| ٣٧ | الصافات | ١٨٢ | ٩٥٢ | ٣٧٩٠ |
| ٣٨ | ص | ٨٨ | ٨٢٠ | ٢٩٩١ |
| ٣٩ | الزمر | ٧٥ | ١٢٧٢ | ٤٧٤١ |
| ٤٠ | غافر | ٨٥ | ١٣٤٣ | ٤٩٨٤ |
| ٤١ | فصلت | ٥٤ | ٨٩٤ | ٣٢٨٢ |
| ٤٢ | الشورى | ٥٣ | ٩٨١ | ٣٤٣١ |
| ٤٣ | الزخرف | ٨٩ | ٩٣٤ | ٣٥٠٨ |
| ٤٤ | الدخان | ٥٩ | ٣٨١ | ١٤٣٩ |
| ٤٥ | الجاثية | ٣٧ | ٥٥٤ | ٢٠١٤ |
| ٤٦ | الاحقاف | ٣٥ | ٧١٤ | ٢٦٠٢ |
| ٤٧ | محمد | ٣٨ | ٦١٣ | ٢٣٦٠ |

| ٤٨ | الفتح | ٢٩ | ٦٣٧ | ٢٤٥٦ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٩ | الحجرات | ١٨ | ٣٨٧ | ١٤٩٣ |
| ٥٠ | ق | ٤٥ | ٤٢٣ | ١٤٧٣ |
| ٥١ | الذاريات | ٦٠ | ٣٩٣ | ١٥١٠ |
| ٥٢ | الطور | ٤٩ | ٣٤٢ | ١٢٩٣ |
| ٥٣ | النجم | ٦٢ | ٤٠٩ | ١٤٠٥ |
| ٥٤ | القمر | ٥٥ | ٣٨٢ | ١٤٣٨ |
| ٥٥ | الرحمن | ٧٨ | ٣٨٥ | ١٥٨٥ |
| ٥٦ | الواقعة | ٩٦ | ٤٢٢ | ١٦٩٢ |
| ٥٧ | الحديد | ٢٩ | ٦٧٢ | ٢٤٧٥ |
| ٥٨ | المجادلة | ٢٢ | ٥٢٥ | ١٩٩١ |
| ٥٩ | الحشر | ٢٤ | ٤٩٦ | ١٩١٣ |
| ٦٠ | الممتحنة | ١٣ | ٣٩٥ | ١٥١٩ |
| ٦١ | الصف | ١٤ | ٢٤٤ | ٩٣٦ |
| ٦٢ | الجمعة | ١١ | ١٩٤ | ٧٤٩ |
| ٦٣ | المنافقون | ١١ | ٢٠٠ | ٧٨٠ |
| ٦٤ | التغابن | ١٨ | ٢٨٦ | ١٠٦٦ |
| ٦٥ | الطلاق | ١٢ | ٣١٨ | ١١٧٠ |
| ٦٦ | التحريم | ١٢ | ٢٨١ | ١٠٦٧ |
| ٦٧ | الملك | ٣٠ | ٣٦٢ | ١٣١٦ |
| ٦٨ | القلم | ٥٢ | ٣٢٤ | ١٢٥٨ |
| ٦٩ | الحاقة | ٥٢ | ٢٨٤ | ١١٠٧ |
| ٧٠ | المعارج | ٤٤ | ٢٤١ | ٩٤٧ |
| ٧١ | نوح | ٢٨ | ٢٦٣ | ٩٤٧ |
| ٧٢ | الجن | ٢٨ | ٣٢٠ | ١٠٨٩ |
| ٧٣ | المزمل | ٢٠ | ٢٢٧ | ٨٤٠ |
| ٧٤ | المدثر | ٥٦ | ٢٨٧ | ١٠١٥ |
| ٧٥ | القيامة | ٤٠ | ١٨٠ | ٦٦٤ |
| ٧٦ | الانسان | ٣١ | ٢٧٨ | ١٠٦٥ |
| ٧٧ | المرسلات | ٥٠ | ١٩٨ | ٨١٥ |
| ٧٨ | النبا | ٤٠ | ١٩٨ | ٧٦٦ |

| ٧٩ | النازعات | ٤٦ | ١٩٥ | ٧٦٢ |
|---|---|---|---|---|
| ٨٠ | عبس | ٤٢ | ١٥١ | ٥٣٨ |
| ٨١ | التكوير | ٢٩ | ١٢٢ | ٤٢٥ |
| ٨٢ | الانفطار | ١٩ | ٨٩ | ٣٢٦ |
| ٨٣ | المطففين | ٣٦ | ١٧٩ | ٧٤٠ |
| ٨٤ | الانشقاق | ٢٥ | ١٢٣ | ٤٣٦ |
| ٨٥ | البروج | ٢٢ | ١٢٤ | ٤٥٩ |
| ٨٦ | الطارق | ١٧ | ٧٠ | ٢٤٩ |
| ٨٧ | الاعلى | ١٩ | ٨٢ | ٢٩٣ |
| ٨٨ | الغاشية | ٢٦ | ١٠٠ | ٣٧٨ |
| ٨٩ | الفجر | ٣٠ | ١٥٥ | ٥٧٣ |
| ٩٠ | البلد | ٢٠ | ٩٢ | ٣٣٥ |
| ٩١ | الشمس | ١٥ | ٦٩ | ٢٤٩ |
| ٩٢ | الليل | ٢١ | ٨٧ | ٣١٢ |
| ٩٣ | الضحى | ١١ | ٤٩ | ١٦٤ |
| ٩٤ | الشرح | ٨ | ٣٠ | ١٠٢ |
| ٩٥ | التين | ٨ | ٣٩ | ١٥٦ |
| ٩٦ | العلق | ١٩ | ٧٦ | ٢٨١ |
| ٩٧ | القدر | ٥ | ٣٢ | ١١٢ |
| ٩٨ | البينة | ٨ | ١٠٣ | ٣٩٤ |
| ٩٩ | الزلزلة | ٨ | ٣٩ | ١٥٦ |
| ١٠٠ | العاديات | ١١ | ٤٤ | ١٦٤ |
| ١٠١ | القارعة | ١١ | ٤٠ | ١٥٨ |
| ١٠٢ | التكاثر | ٨ | ٢٨ | ١٢٢ |
| ١٠٣ | العصر | ٣ | ١٨ | ٧٠ |
| ١٠٤ | الهمزة | ٩ | ٣٥ | ١٣٣ |
| ١٠٥ | الفيل | ٥ | ٢٤ | ٩٦ |
| ١٠٦ | قريش | ٤ | ١٩ | ٧٣ |
| ١٠٧ | الماعون | ٧ | ٢٧ | ١١٢ |
| ١٠٨ | الكوثر | ٤ | ١١ | ٤٢ |
| ١٠٩ | الكافرون | ٦ | ٣٠ | ٩٥ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١١٠ | النصر | ٣ | ٢٢ | ٧٩ |
| ١١١ | المسد | ٥ | ٢٦ | ٨١ |
| ١١٢ | الاخلاص | ٤ | ١٧ | ٤٧ |
| ١١٣ | الفلق | ٥ | ٢٦ | ٧١ |
| ١١٤ | الناس | ٦ | ٢١ | ٨٠ |

## خشتەی چوارەم

## ناوی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز بەکوردی.

| ژمارە | ناوی سورەت بە عەرەبی | ناوی سورەت بەکوردی | ژمارە | ناوی سورەت بەعەرەبی | ناوی سورەت بەکوردی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | الفاتحة | کرانەوە | ٥٨ | المجادلة | ئافرەتە گفتوگۆکارەکە |
| ٢ | البقرة | مانگا | ٥٩ | الحشر | کۆکردنەوە |
| ٣ | ال عمران | خانەوادەی عیمران | ٦٠ | الممتحنة | تاقیکراوە |
| ٤ | النساء | ئافرەتان | ٦١ | الصف | پۆل |
| ٥ | المائدة | سفرە و خوان | ٦٢ | الجمعة | رۆژی هەینی |
| ٦ | الانعام | ئاژەڵان | ٦٣ | المنافقون | دووڕووەکان |
| ٧ | الاعراف | بەرزای | ٦٤ | التغابن | بەکەم دانان |
| ٨ | الانفال | ئەنفال | ٦٥ | الطلاق | جیابوونەوە |
| ٩ | التوبة | التوبە | ٦٦ | التحريم | حەرامکردن |
| ١٠ | يونس | یونس | ٦٧ | الملك | دەسەڵات |
| ١١ | هود | هود | ٦٨ | القلم | پێنووس |
| ١٢ | يوسف | یوسف | ٦٩ | الحاقة | راستی |
| ١٣ | الرعد | هەورە بروسکە | ٧٠ | المعارج | شوێنی بەرزبوونەوە |
| ١٤ | ابراهيم | ئیبراهیم | ٧١ | نوح | نوح |
| ١٥ | الحجر | بەردەڵان | ٧٢ | الجن | جنۆکە |
| ١٦ | النحل | مێشەهەنگ | ٧٣ | المزمل | خۆداپۆشەر |
| ١٧ | الاسراء | شەورەوی | ٧٤ | المدثر | خۆپێچاوە |

| ١٨ | الكهف | ئەشكەوت | ٧٥ | القيامة | ڕۆژی دوای |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩ | مريم | مەریەم | ٧٦ | الانسان | مرۆڤ |
| ٢٠ | طه | طه ها | ٧٧ | المرسلات | نێردراوان |
| ٢١ | الانبياء | پێغەمبەران | ٧٨ | النبا | هەواڵ |
| ٢٢ | الحج | حەج | ٧٩ | النازعات | دەرکێشەران |
| ٢٣ | المؤمنون | باوەڕداران | ٨٠ | عبس | ڕوگرژی |
| ٢٤ | النور | ڕووناکی | ٨١ | التكوير | لولکردن |
| ٢٥ | الفرقان | جیاکاری | ٨٢ | الانفطار | شەقبوون |
| ٢٦ | الشعراء | شاعیران | ٨٣ | المطففين | حیلەکاران |
| ٢٧ | النمل | مێرووله | ٨٤ | الانشقاق | لەتبوون |
| ٢٨ | القصص | چیرۆکەکان | ٨٥ | البروج | ئەستەرەکان |
| ٢٩ | العنكبوت | جاڵجاڵۆکه | ٨٦ | الطارق | لێدەر |
| ٣٠ | الروم | ڕۆم | ٨٧ | الاعلى | بڵندترین |
| ٣١ | لقمان | لوقمان | ٨٨ | الغاشية | داپۆشەر |
| ٣٢ | السجده | سوژده | ٨٩ | الفجر | سپێده |
| ٣٣ | الاحزاب | تیره | ٩٠ | البلد | شار |
| ٣٤ | سبا | ناوچەیەکە لە یەمەن | ٩١ | الشمس | خۆر |
| ٣٥ | فاطر | دروستکار | ٩٢ | الليل | شەو |
| ٣٦ | يس | یاسین | ٩٣ | الضحى | چێشتەنگاو |
| ٣٧ | الصافات | پۆلە ڕێکەکان | ٩٤ | الشرح | ڕونکردنەوە و کردنەوە |
| ٣٨ | ص | صاد | ٩٥ | التين | هەنجیر |
| ٣٩ | الزمر | پۆل پۆل | ٩٦ | العلق | دڵۆپەخوێنێکی مەیو |
| ٤٠ | غافر | لێخۆشبوو | ٩٧ | القدر | شەوی قەدر |
| ٤١ | فصلت | ڕونکراوە | ٩٨ | البينة | بەڵگە |
| ٤٢ | الشورى | ڕاوێژکردن | ٩٩ | الزلزلة | بومەلەرزە |
| ٤٣ | الزغرف | نەخش و نیگار | ١٠٠ | العاديات | ئەسپی شەر |
| ٤٤ | الدخان | دوکەڵ | ١٠١ | القارعة | لێدانی سەخت |
| ٤٥ | الجاثية | لەسەر چۆک کەوتوو | ١٠٢ | التكاثر | زۆر پەیداکردن |
| ٤٦ | الاحقاف | شاخی لم | ١٠٣ | العصر | سەردەم و زەمانە |
| ٤٧ | محمد | محمد | ١٠٤ | الهمزة | توانجدان |
| ٤٨ | الفتح | ڕزگارکردن | ١٠٥ | الفيل | فیل |

| ٤٩ | الحجرات | ژورەکان | ١٠٦ | القريش | قورەیش |
|---|---|---|---|---|---|
| ٥٠ | ق | قاف | ١٠٧ | الماعون | یارمەتی دراوسێ |
| ٥١ | الزاريات | بڵاوکەرەوەکان | ١٠٨ | الكوثر | بەپیت |
| ٥٢ | الطور | کێوی طور | ١٠٩ | الكافرون | کافرەکان |
| ٥٣ | النجم | ئەستێرە | ١١٠ | النصر | سەرکەوتن |
| ٥٤ | القمر | مانگ | ١١١ | المسد | گوریسی بەستراو |
| ٥٥ | الرحمن | بەرەحمترین | ١١٢ | الاخلاص | دڵسۆزی |
| ٥٦ | الواقعة | ڕوداوی ڕاستی | ١١٣ | الفلق | بەرەبەیان |
| ٥٧ | الحديد | ئاسن | ١١٤ | الناس | خەڵکی |

## خشتەی پێنجەم

### خشتەیەک بۆ خەتمکردنی قورئانی پیرۆز لە ماوەی مانگێکدا.

| ژمارەی خەتماکان | بەیانی | نیوەڕۆ | عەسر | شێوان | خەوتنان | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| یەک جار | ٤ لاپەرە | ٤ لاپەرە | ٤ لاپەرە | ٤ لاپەرە | ٤ لاپەرە | ٢٠ لاپەرە |
| دوو جار | ٨ لاپەڕە | ٨ لاپەرە | ٨ لاپەڕە | ٨ لاپەڕە | ٨ لاپەڕە | ٤٠ لاپەرە |
| سێ جار | ١٢لاپەڕە | ١٢ لاپەڕە | ١٢ لاپەڕە | ١٢ لاپەڕە | ١٢ لاپەڕە | ٦٠ لاپەرە |

# سەرچاوەکان

کتێب:

١ – شێخ ئەحمەد کاکە مەحمود، تەفسیری کوردی ڕامان.

٢ – صلاح الدین عبدالکریم، تەفسیری ڕێبەر.

٣ – بورهان محمد امین، تەفسیری ئاسان.

٤ – محمد مەلا سالّح، تەفسیری پوختای قورئان.

٥ – خالد بکر، المعطیات الرقمیة في القران الکریم

٦ – قاسم عاشور، ١٠٠٠ سؤال و جواب في القران الکریم.

٧ – الشیخ الباز توفیق، جدول حفظ القران الکریم.

ماڵپەڕەکان:

١ – موضوع.

٢ – ویکیبیدیا عربیة.

٣ – هەیڤ.

٤ – www.elforkan.com

٥ – www.adlat.net

٦ – www.zyadda.com

٧ – www.mah٦at.net

٨ – www.elkhabar.com

وتارەکان

١ – پ،د،عوسمان هەڵەبجەی.

٢ – شەماڵ موفتی، ئیعجاز لە قورئانی پیرۆزدا، بەشی یەکەم.

ئەکاونتەکان:

١ –ئینستاگرام،زانیاری جیهان.

٢ – ئینستاگرام،هەسارەی زانیاری.

بەرنامەکان:

١ – قورئانی پیرۆز، دروستکردنی هیوا سەڵاح.

٢ – قورئانی پیرۆز، دروستکردنی ڕیڤار عبدلله.

٣ – ڕوناکی ئیسلام، دروستکردنی ئەمین صمد.



وەک لە ناوی کتێبەکەدا دیارە، ئەم کتێبە زیادکردنی زانیارییەکانە سەبارەت بە قورئان یان ئەوانەی قورئان باسی کردوون، کە لە شەش بەشی جیاوازدا خۆی دەبینێتەوە، لە هەر بەشێکدا کۆمەڵێک تایبەتمەندیی قورئانی پیرۆزم کۆکردۆتەوە و وەکو بەشێکی سەربەخۆ ناساندوومە، کە وا لە خوێنەر دەکات زیاتر گەورەیی قورئان و بێدەسەڵاتیی مرۆڤی لە ئاست ئەم کتێبە بۆ دەربکەوێت و سەرسام و دەسەوستان بەدیار ناوازەیی ئەم کتێبە پیرۆزەوە رابمێنێت، کە لە توانای هیچ کەسێکدا نییە بەم شێواز و جۆرە کتێبێکی وەها بنووسێت. لە کاتێکدا خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە دەبێتەوە زیاتر لە جاران ئاشنایی لەمەڕ قورئانی پیرۆز پەیدادەکات و لە تایبەتمەندی و جیاوازی و ناوازەیی (وشە و ئایەتەکان و سورەتـ)ـەکان تێدەفکرێت. هەرچەندە کتێبەکە پتر لەمەی ئێستا لەبەردەستدایە هەڵدەگرێت بەڵام کورت و پوخت ئاماژەم پێداون و پەیامەکەم گەیاندووە و خۆم دوورە پەرێزکردوە لە بێزاربوونی خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە.

